ئەلیکساندەر گەڕبۆڤسکی

# نهێنی کۆنترین مێژوو

لەڕووسییەوە: جەلال تەقی





دەزگای ڕۆشنبیری
جەمال عیرفان

نووسراوی ئاینی و
ئەفسانەی گەلان، لە
راستیدا، کۆنترین
سەرچاوەی مێژوون کە
پێمان گەیشتوە. هەندێك
دۆزینەوەی ئەم ساڵانی
دوایی یە زۆر راستیی وایان
سەلماندوە کەلەوە پێش
تەنها لە ئەفسانە و پەڕاوە
ئاینی یەکان دا باس
کرابوون. ئەمەش شتێکی
سەیر نیە.

ناوەندی توێژینەوەی مێژوویی جەمیل ڕۆژبەیانی ٢٠١٧

بەڕێوەبەری دەزگا: سیروان حەمەسەعید

**ناوی کتێب: نهێنی کۆنترین مێژوو**
**بابەت: مێژوو**
**ناوی نووسەر: ئەلیکساندەر گەڕبۆڤسکی**
**لە ڕووسییەوە: جەلال تەقی**
**دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی**
**دیزاینی ناوەوە: ئومێد محەمەد**
**زنجیرە: ( ٢٩ )**
**تیراژ: ١٠٠٠ دانە**
**نۆرەی چاپ: ٢٠١٧**
**نرخ: ٤٠٠٠ دینار**
**چاپ: چاپخانەی ئاران**

**لەبەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٠٢٨ )ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە**

Tel: 0533202936 07502216705
email: jamalerfan99@gmail.com

facebook: Jamal Erfan's Library
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی - کاسۆ مۆڵ - بەرامبەر مزگەوتی گەورە - نهۆمی چوارەم

# پێڕست

## چەند وتەیەك

### خوێنەواری بەڕێز :

ئەم پەڕاوەی ئەلیکساندەر ئەلفریدۆڤیچ گەڕبۆڤسکی بە شێوەیەکی زانیاری سادە باسی ئەو شارستانیەتە بەرزە کۆنە ئەکات کە پێش نزیکی چواردە هەزار ساڵ بە هۆی کارەساتێکی جیهانیەوە لە ناو چوە، ئەو کارەساتەی رووی زەوی و باری هەموو مرۆڤایەتی گۆڕیوە و جیهانی بۆ ماوەی چەند سەدەیەک گێڕاوەتەوە بۆ ژیانێکی تاریکی و نەزانی. گەڕبۆڤسکی نووسەر و زانا بۆ سەلماندنی راکانی جۆرەها زانیاری جیاجیای وا بەکار ئەهێنێ کە هەست ئەکەی رەنگە ئەم مرۆڤە مەزنە هەموو ژیانی تەرخان کردبێ بۆ ئامادە کردنی ئەم باسە. گرنگ ئەوەیە نووسەربێ ترس و ئازایانە ئەو خاڵانە دێنێتە گۆڕێ کە زۆر کەس سڵیان لێ ئەکاتەوە. لە دەستنوس و شوێنەواری گەلانی هەموو سەر زەوی ئەکۆڵێتەوە و لە چوارچێوەی ئەفسانە و چیرۆکی کۆنی تیرە (دڕندەکان) دا ترووسکایی ئەقۆزێتەوە بۆ ئاشکرا کردنی رووداو، و سەلماندنی شارستانیەتێکی هێندە پێشکەوتوو کە ئازایانە بەراوردی ئەکات لە گەڵ شارستانیەتی ئیستادا. لە باسێکی نزیک لە باسی (چەرخ و فەلەک) ی پیرێژنی چیرۆکە کۆنە کوردی یەکانەوە ئەیسەلمێنی کە مرۆڤی پێش هەزارەها ساڵ توانای دروست کردنی ئامرازی بەرز بوونەوە و فڕینی بە ئاسمان دا هەبوە. لە پشکنینی ئەشکەوتی شاخەکانی کوردستان دا روونی ئەکاتەوە کە پێش سەد هەزار ساڵ ئەم ناوچەیە ئاوەدان بوە و مرۆڤی ژیری تێدا ژیاوە. نووسەر دەری ئەخات گەلی لە ناو چووی ((مای)) ئەوەندەی

ئێستا شارەزای سووڕانەوەی زەوی بوون بە دەوری ڕۆژدا و بە وردی حەسابی ماوەکەیان کردوە.

ئەیسەلمێنی کە گەلانی زۆر کۆن چەکی کوشندەی وایان هەبوە (وەک بروسکە داویە لە سوپای دوژمن و لە ئەنجامی تەقینەوەی دا تەم و ئاگر بەری ڕۆژی گرتوە.)

ئەمە و زۆر شتی تر، ئەی خوێندەواری خۆشەویست، لەم پەڕاوە نایابەی گەڕبۆڤسکی دا ئەخوێنیتەوە. هیوادارم جێگای ڕەزامەندی تۆی بەڕێز بێت و چاوەڕێ ی دڵفراوانی تۆم بۆ لێ بووردنی هەڵەکانم.

**جەلال تەقی**

**سلێمانی – کۆتایی ١٩٧٩**

## پێشەکی

چاپی یەکەمی[1] ئەم پەڕاوەی ئەلیکساندەر گەڕبۆڤسکی کە لە ساڵی ١٩٦٦ دا دەرچــو، ئەوەنــدەی پــێ نــەچوو دوا دانــەی لــە لایــەن خوێندەوارانەوە قۆزرایەوە. ئەمەش بە ڕێکەوت نیە. چۆنکە ئەم باسە دەربارەی ئەو (شارستانیەتە) بەرزە ئەدوێ کە لە کۆن دا هەبوە و لە ئـەنجامی کارەسـاتێکی جیهـانی دا، کـە ڕووی زەوی و پاشـە ڕۆژی مرۆڤایەتی گۆڕیوە، لە ناو چوە. لەم سـەدەیەی ئێمـەدا ئـەو دیاردە تێکراییانـەی کـە هـەموو ڕووی زەوی گرتۆتـەوە ڕێگایـەکی نـەبینراوی بـە هێزی لـە ئاتمەسفێر[2] و ئـەودیو ئاتمەسـفێرەوە تـەنیوە لـە هـەموو کاتێک پتر مرۆڤایـەتی ئەبەستێت بـە یەکـەوە، بۆیـەش هـەر پـەڕاوێک دەربارەی دیاردەی وا تێکڕایی بدوێ گرنگیەکی زۆری پی ئەدرێ.

بێجگە لەمەش، ئەم پەڕاوە (هیپۆتیز) یکی[3] زانیاریە و نووسەر بۆ سـەلماندنی بیروڕاکـانی زیرەکانـە زۆربـەی زانیـاری یـەکانی ئـەم سەردەمە بەکار ئەهێنێ.

بە پێ ی توانای زانیاری ئێستامان ناتوانرێت ئەوە بسەلمێنرێ ئایا ئـەم کارەسـاتە ڕووی داوە یـان نـەء، بـەڵام ئەگـەر گریمـان ئـەوەی

---

1- مەبەست لە چاپی یەکەمی رووسی یەکەیەتی .

2- ئاتمەسـفێر : ووشـەیەکی یۆنـانی یـە Atoms هـەڵم + Sphaira خـڕ : ئـەو چینـە هەوایەی دەوری خڕۆکی زەوی داوە .

3- هیپـۆتیز : hypothesis وشـەیەکی یۆنـانی یـە : پێشـنیاری زانیـاری بـۆ سـەلماندنی دیاردەیەک بە هۆی تیۆری و تاقی کردنەوەوە .

نووسـەر باسـی ئـەكات و ژمارەیـەكی زۆر پشـتگیری ئەكـەن وابێ، وا زۆر رووداو كـە هۆیـەكانیان نادیـارن و لـە سـنوری مێشـك بـەدەرن ئەبنـە شـتێكی ئاسـایی. نووسـەر زۆر بـە وردی وشـارەزایانە لـەم بارەیـەی كۆڵیوەتـەوە. دیـارە هـەموو ئـەو شـتانەی لـەم پەڕاوەدا بـاس كراوە نەسەلمێنراون، ئەگەر وا بوایە نەئەتوانرا ناوی بنرێ (هیپۆتێز).

أ. گەڕبۆڤسكی دەربارەی ئەوە ئەنووسی كە زانا پێویستە لـە بیرو ڕاكانی دا نەترس بێ و چی بەراست زانی باسی بكات. زانا نـەك هـەر تەنها دەنگی مێژووە، بەڵكو سەرباز و پارێزەریشیەتی. هەروەها بوێژ و خەیاڵ بڵاوی بێ بڕواش هەر پێویستن بۆ زانیاری، چونكە بی یـەك گرتنی ئەمانە دۆزینەوەی راسـتەقینە ناهێنرێتـە كایـەوە. مرۆڤایـەتی لـە هـەموو كاتێك دا ئاواتی پشـكنین و روون كردنـەوەی دیـاردە لـە بیر چوەكـانی مێـژوو بـووە، و هـەر ئەمـەش رێگـای بـۆ دۆزینـەوەی راستەقینە خۆش كردوە. بۆیە (نوسەر) ی چیرۆكـی (چـەرخ و فەلـەك) ی ئەفسـانە كۆنـەكان بـە دروسـتكەری راسـتەقینەی فڕۆكـەی ئێسـتا ئـەژمێردرێ هەرچەنـدە لـە دوو سـەردەمی زۆر لەیـەك دووردا ئەم دوو دیاردەیە هاتوونەتە كایەوە.

دیارە نـاتوانین هـەموو پێشـنیارەكانی نووسـەر بە (سـەلماو) دابنـی یـن بـە تایبـەتی باسـی جیهـانی پـێش (كارەسـاتەكە) و ئـەو بەشـە زانیاریانـەی لـەو كاتـەوە ماونەتـەوە. هـەروەها ئـەو زانیاریانـەی لـەم دواییەدا روون كراونەتەوە، كە گوایە مرۆڤ زۆر لەوە كۆنتر دروست بوە كە هەتا ئێستا وتراوە، نابنە بەڵگەی سەلماندنی ئەوەی كە رۆژێك لـە رۆژان (شارسـتانیەتێك) ی بـەرزی تێكڕایـی هـەموو مرۆڤایـەتی

بەیەکەوە بەستۆتەوە و ئەم شارستانیەتەی ئێستا بەشتێکی لەبیر کراوی ئەو شارستانیەتە کۆنەیەو دووبارە مرۆڤایەتی دۆزیویەتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، نووسەر بە شێوەیەکی راست و بەهێز بیروڕاکانی ئەسەلمێنی و راستی کارەساتەکە دەرئەخات و کاتی روودانی ئەچەسپێنی. هەوڵ ئەدات بە ووردی نەخشەی جیهانی ئەوسا بکێشی و پەیوەندی گەلانی کۆن بەیەکەوە دەربخات بۆ ئەمەش نموونەی زانیاری مێژوویی، و ئارکۆلۆجی [٤] و جوغرافی، و ئێتنۆگرافی [٥] و کلیماتالۆجیا [٦] و ماتیماتیکی و... دێنێتەوە. بەڵام نووسەر، ئەو باسانەی کە تیایدا ناگاتە ئەنجامێکی زانیارانە (لەخۆیەوە) نایان سەلمێنی و ئەیان هێڵێتەوە بۆ بیرکردنەوە و سەلماندنی پاشە رۆژ. نووسەر بە شێوەیەکی بەتام و (زیندو) رای خۆی دەربارەی چەند دیاردەیەکی نەسەلمێنراوی (زەوی) و (مرۆڤایەتی) پیشان ئەدات و بە یەکیانەوە ئەبەستێتەوە و بە ساکاری

---

٤ - ئارکۆلۆجی : وشەیەکی یۆنانیە archaios کۆن + loges زانین : زانیاری دەربارەی رابوردووی مرۆڤایەتی بە هۆی کەرەستەی پاشماوەی و شوێنەواریەوە ( علم الاثار ) وەرگێر .

٥ - ئێتنۆگرافی : وشەیەکی یۆنانیە : ethnos گەل + grapho ئەنوسم زانیاری دەربارەی شوین و زانیاری و دروست بوون و رادەی رۆشنبیری و پێشکەوتنی گەلان ( علم الاجناس ) وەرگێر .

٦ - وشەیەکی یۆنانی یە Klimatos لار + Logos زانین : زانیاری پەیدا بون و گۆڕینی ئاو ، و هەوا ( علم المناخ ) یۆنانی یە کۆنەکان رایان وابوو کە ئەگەر تیشکی رۆژ بە ستوونی بگاتە سەر زەوی گەرم ئەبێت و ئەگەر بە لاری بگات سەرد ئەبی ، بۆیە ئەم وشەیە بەکار هێنراوە بۆ ئەم زانیاری یە . وەرگێر

یەکی وا دەریان ئەخات کە هەموو کەس تێی بگات. ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورەیە.

بەڕای ئێمە، ئەم پەڕاوەی (گەربۆڤسکی) زۆر سەرکەوتوانە نووسراوە و زۆربەی خوێندەواران بە ئارەزوویەکی بەتینەوە ئەیخوێننەوە.

**گ. ب. ڤیدورۆڤ**
**دوکتۆری زانیاری مێژوویی**

## بیرەوەری کارەساتەکە

نووسـراوی ئـاینی و ئەفسـانەی گـەلان، لـە راسـتیدا، کـۆنترین سـەرچاوەی مێژوون کە پێمـان گەیشتوە. هەندێک دۆزینـەوەی ئـەم سالآنی دوایی یە زۆر راستیی وایان سەلماندوە کەلەوە پێش تەنها لـە ئەفسـانە و پـەڕاوە ئـاینی یـەکان دا بـاس کرابـوون. ئەمـەش شـتێکی سـەیر نیـە، چونکـە (پـەڕاوە پیرۆزەکـان) و ئەفسـانە ئـاینی یـەکان کـە یادگـارە کۆنـەکانیان کـۆ کردۆتـەوە بەمـە هەنـدێک رووداوی راستەقینەی گـەلانیان پاراسـتوە. ف. ئـەنگلس ئـەڵی کـە ئـەو شـتانەی دەماودەم لە گەلانی رابوردوەوە گێڕاونەتـەوە (هۆیـەکی سـەرەکین بۆ راست کردنەوەی زانیـاری دەربـارەی کەرەستەی مێژوویی و دیـاری کردنـی یـەک بـەدوای یەکدا هاتنیـان، بۆیـە مێـژوو نـووس پێویسـتە هەوڵی ئەوە بدات کە لە چیرۆکی دەماوەدەم و سەرچاوە ئاینی یەکان دا ئەو مەبەستانە بدۆزێتەوە کە بتوانرێ بکرێن بە بنچینەی زانیاری).

هـەر بـەم شـێوەیە، بـۆ وێنـە، (گ. شـلیمان) ی زانـای ئـارکیولۆجی ئەڵمانی بە هۆی ورد بوونەوە و لێکۆڵینەوە لە چەند دێڕێکی نادیـاری هەڵبەسـتەکانی (ئـەلیادە) ی (هـۆمیرۆس) تـوانی شـوێنەواری شـاری (تـەڕوادە) ی ئەفسـانەیی بدۆزێتـەوە و سـەرلە نـوێ کـەلاوەکانی بخاتەوە بەر تیشکی رووناکی و ئەو تەروادەیەی کە هـەتا ئەوکاتـە بـە ئەنجامی بیرێکی لە خـەیاڵ دا دروسـت کراو دائەنرا بکات بـە راسـتی یەکی ون نەبوو. هـەر بـەم جۆرەش زاناکـان توانیویانـە بـە هـۆی تاڵـە دەزووی باس کراوەوە لە ئەفسانەی کۆن و سەرچاوە ئاینی یەکان دا شارستانیەتی فراوانی ون بوو بدۆزنەوە.

نووسراوی سەر خشتە قوڕەکانی ((سۆمەر)) ناوی پێنج شاریان هێناوە : ئەریدۆ، باب تیبرا، لاراک، سیپار و شوروپاک، کە گوایا پێش کارەساتی لافاوەکە هەبوون. ئەگەر بهاتایە و بوونی ((لافاوەکە)) بە خەیاڵێک دابنرایە ئەبوایە ئەم شارانەش هەر بە خەیاڵ بژمێردرانایە، ئەوساش زانایانی ئارکیۆلۆجی نەیان ئەتوانی سێ شار لەم شارانە بدۆزنەوە : ئەریدۆ، سیپار و شوروپاک. بێجگە لەمەش، لە هەمان شوێن دا شوێنەواری لافاوێکی زۆر بەهێز بینراوە کە ئەوکاتە داویە لەم ناوچانە. ئەمە بۆتە بنچینە بۆ ئەوەی بێ ترس پێشنیاری بوونی ئەو لافاوە جیهانی یە قوبوڵ بکەن کە نوسراوە سۆمەری یەکان و چیرۆکەکانی ئینجیل باسیان کردوە.

لە ئینجیل دا ئەم دێڕانە ئەخوێنینەوە : (لە حەوتەم رۆژی مانگی دوهەم دا هەموو سەرچاوەی ئاوی ئاسمان کرایەوە وچل شەو، و چل رۆژ لەسەریەک باران باری).

هەزار ساڵێک پێش ئەم دێڕانە لە نووسراوە سۆمەری یەکان دا ئەمە ئەخوێنینەوە : (سەر لەبەیانی ئاسمان شێوا و شەو رەهێڵەیەکی وا بە سام دایکرد نەئەتوانرا سەیری بکرێ. رۆژی یەکەم بای باشوری هەڵی کرد و شاخ و دۆڵەکانی پڕ کرد و وەک جەنگ دای بەسەر خەڵکدا و وای لێ هات چاو چاوی نەئەبینی.)

هەر وەک لە ئینجیل دا، لێرەشدا مەبەست لەو لافاوەیە کە هێرشی هێنایە سەر مرۆڤایەتی و لەناوی برد.

ئەو کارەساتەی زۆربەی مرۆڤایەتی و ژیانی لە سەر زەوی لە ناوبرد هەر تەنها لەم ناوچانەدا باس نەکراوە. هەواڵی ئەمە لە پەڕاوە ئاینی یە میسریەکان و سانسکریتی یەکان و هیندی یەکان و لای

گەلانی ئۆقیانووسی ((هێمن)) و هەر دوو ئەمەریکادا بلاوە و باس کراوە. هەروەها هەندێک وێنە و نیگاری کۆنی ئەم رووداوەشمان پێ گەیشتوە وەک وێنەی – ١ – ی ((ئاتسی) یەکان و وێنە – ٢ – بابلی کۆن.

(ج. فریزەر) ی زانای ئینگلیزی کە باسی ((ئیقلیم گیری)) [1] ئەم کارەساتە ئەکات ئەڵی کە لە ئەفسانەی ئەو (١٣٠) تیرە هیندی یانەی لە سەروو، و ناوەراست و خوارووی ئەمەریکا ئەژین یەکێکیان نیە باسی ئەم لافاوەی تێدا نەبێ.

پەراوی (چیمالپۆپۆک) ی مەکسیکی کۆن لەم بارەیەوە ئەڵی : (ئاسمان لە زەوی نزیک بوەوە و بە یەک رۆژ هەموو گیان لەبەری سەر زەوی مردن و شاخ و کێوەکانیش ئاو دایپۆشین.. ئەشڵێن ئەو تاشە بەردانەی ئێستا ئەیان بینین ئەوسا هەموو زەوی داپۆشی بوو و ئەکولان و هاژە و گڕی شاخە سوورەکان بەرز ئەبوونەوە.)

لە پەراوی (پۆپۆل ڤووخ) دا کە سەرۆکی ئاینی یە هیندی یەکانی (کیچی) – کە نەوەکانیان ئێستا لە گواتیمالا ئەژین نووسیویانە – بەم جۆرە دەربارەی ئەم کارەساتە ئەدوێ : (رووی زەوی تاریک بوو، و بارانێکی رەش بی وەستان شەو و رۆژ باری.. و لافاوێکی گەورە هەستا. خەڵک حەپەسان و بەیەکدا ئەهاتن.. ئەچوونە سەربانی خانوەکانیان بۆ ئەوەی خۆیان رزگار بکەن بەلام خانوەکان ئەروخان و ئەیان خستنە ئاوەکەوە، ئەچوونە سەر دارەکان، دارەکان

---

١ – مەبەست لەوەیە کە هەموو جیهانی گرتۆتەوە .

ئەشکانەوە.. خۆیان لە ئەشکەوت و سەر شاخەکان دا ئەشاردەوە ئاوەکە ئەیان گەیشتی و ئەیکوشتن.. بەم جۆرە مرۆڤی سەر زەوی، کە بڕیار درابوو نەمێنن، لەناو چوون..)

یادی ئەم کارەساتە لە ناو هیندی یە سوورەکانی گۆمی (ئامەزۆن) یش دا ماوە : (لەپڕ رۆژێک زەوی گرماندی و تروسکایی رووناکی نەما، و پاش ئەمە باران و رەهێڵە و لافاوێکی بەهێز هەموو زەوی داپۆشی.)

ئەفسانەیەکی بەرازیلی ئەڵی : (رەهێڵە و تاریکی ماوەیەکی زۆری خایاند، ئاو ئەوەندە بەرز بوەوە هەموو شتێکی سەر رووی زەوی داپۆشی.. خەڵک لەتاودا نەیان ئەزانی چی بکەن و ئەچوونە سەر بەرزترین درەخت و شاخەکان.)

هەر لەوکاتەدا، لەوە ئەچی، لە هە ندێک شوێن دا شاخ پەیدا بووبێ. ئەفسانەی هیندی یەکانی دورگەی (شارلوت) ئەڵی : (پێش لافاوەکە زەوی بەم جۆرەی ئێستا نەبوو، و شاخ پەیدا نەبووبوو.) ئەوە بوو لە پەڕاوی (چیمالپۆپۆک) یش دا بینیمیان کە ئەڵی : (شاخە سوورەکان ئەکولان) ئەمەش رەنگە مەبەستی لەو ئاگر و مەعدەنە تواوانە بێ کە بورکانە تەقیوەکان فڕێ یان ئەدان.

هەواڵی هەمان لافاو، کە بوومە لەرزە و رەهێڵە و گەرداو و تەقینەوەی بورکانی لەگەڵ بوە لە ئەفسانەی گەلانی ئەفەریقاشدا هەتا ئێستا هەرماوە.. لەوەش ئەچی مەبەستیان کارەساتێک بووبێ کە لە نێوان ئەمەریکا و ئەفەریقادا رووی دابێ. بەڵگەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە کەهەتا لە (ئەتڵەسی) دوور بکەوینەوە شێوە و ناوەڕۆکی ئەم

ئەفسانە ئەگۆڕێ و کارەساتەکە هێزی کەمتر ئەبی، هەتا وای لی دێ لەهەندێ جێگادا تەنها باسی لافاوە و هیچی تر. بۆ وێنە، لەناو هیندی یە سوورەکانی تیرەی (تلینگیت) ی ئالاسکادا تەنها باسی لافاو ئەکرێ. لێرەخەڵکەکە رایان کردۆتە سەر شاخەکان و لە ئاوەکە دوور کەوتوونەتەوە و ورچ و گورگ بێ ترس بەرەو خەڵکەکە مەلەیان کردوە و ناچار بە ڕم لە خۆیان دوور خستۆنەتەوە.

لە ئەمەریکای خوارووش هەمان شێوە دووبارە ئەبێتەوە، دانیشتوان لە ترسی لافاو چوونەتە سەر شاخەکان و خۆیان رزگار کردوە.

ئەگەر بە خەیاڵ لە چەقی کارەساتەکەوە بەرەو رۆژهەڵات، بەناو زەریای سپی ناوڕاست و ئێران دا بڕۆین و بگەینە چین ئەبینین بەرەبەرە شێوە و هێزی لافاوەکە ئەگۆڕێ. بۆ وێنە، ئەفسانە یۆنانی یەکان ئەڵێن کەلە کاتی لافاوەکەدا هەموو زەوی (ئەلەرزی)، هەبوو رایان ئەکردە سەر شاخەکان و هەشبوو سواری بەلەم ئەبوون و بەسەوڵ لێدان بەو جێگایانەدا ئەڕۆیشتن کە پێش ئەمە کێڵابوویان، هەشبوو ماسی لەسەر دەوەنەکان کۆ ئەکردەوە.

وەک ئەبینین لەم ناوچەیەدا تەنها بۆمەلەرزە رووی داوە و ئاو لەسەری هەندێک درەخت بەرزتر نەبۆتەوە.

لە پەڕاوی پیرۆزی (زەند – ئاویستا) ی ئێرانی یە کۆنەکان دا ئەڵێ کە (لەکاتی لافاوەکەدا ئاو هێندەی باڵای مرۆڤێک بەرز بووبووەوە.)

ئەفسانەی خوارووی رۆژهەلاتی ئاسیا و چین ئەلّی کە ئاوی زەریا پاش ئەوەی هێرشی هێنا بەسەر رۆخەکان لە دواییدا بەرەو خوارووی رۆژهەلاّت کشایەوە.

ئەمەش گومانی تێدا نیە کە ئەگەر لە لایەکی سەر زەوی لافاو هێندەی شاخێک بەرز بووبێتەوە ئەبێ لە لایەکەی تری سەر زەوی دا نزم بووبێتەوە و کشابێتەوە بەرەو ئەو لایەی ئاوەکەی لێ بەرز بۆتەوە. بۆیە هەتا بەرەو رۆژهەلاّت بڕۆین هەوالّی نزم بوونەوەی ئاو ئەبیستین.. هەر لەبەر ئەمەشە کە لە ئەمەریکای ناوەراست دا ئاو هەتا بەرزترین لوتکەی شاخ گەیشتوە و لە یۆنان دا هەتا سەر دەوەنەکان و لە ئێران دا بالاّی زەلامێک بەرز بۆتەوە.

ئا ئەمەیە ئەو نەخشە تێکڕاییەی کە لە ئەفسانەی زۆربەی گەلان دا هەیە. ئەوەی سەرنج رائەکێشی ئەوەیە کە ئەم هەوالّە لە زۆربەی ئەفسانەی ئەو گەلانەدا کە هەزارەها کیلۆمەتر لەیەک دوورن زۆر لەیەک ئەچن، بۆ وێنە، لە هەموویان دا (یەکێک) ئاگاداری دانیشتوان ئەکات کە کارەساتێک رووئەدات. لە داستانی بابلی دا خواوەند (ئێیا) شا (کسیسۆترۆس) ئاگادار ئەکات و پێ ی ئەلّێ : (ئەی کوڕی ئووباڕا تووتوو، خانوەکەت بڕووخێنە و کەشتی یەک دروست بکە، گوێ مەدەرە کەل و پەل و سامانت، و خۆت رزگارکە، بەلاّم بیرت نەچێ، گیان لەبەری جیاجیا لەگەلّ خۆت هەلّگرە.)

خوای (ئاتسی) یەکانیش هەر بەم شێوەیە ئەدوێ : (ئیتر خۆت بە مەی دروست کردنەوە خەریک مەکە و لەقەدی درەختێکی گەورە بەلەمێک دروست بکە چونکە لە مانگی ئۆز ونتلی دا ئاو ئەگاتە بەرزایی ئاسمان.)

له ئینجیلیشدا خوا (نوح) لەم بەلایە ئاگادار ئەکات [2] هەر بەم جۆرەش (ڤیشنوو) ی خوای هیندی یە سوورەکان مرۆڤایەتی لەم بەلایە ئاگادار ئەکات.

له دورگەکانی ئۆقیانووسی (هێمن) یش دا جۆرەها ئەفسانە هەیە کە گوایا ئەوەی لە لافاوەکەدا بەلەم و کەشتی دروست کردبوو رزگاری بوو و ئەوانی تر خنکان.

ئەفسانەیەکی نوسراوی (بیرما) باسی مرۆڤێکی (رەش پۆش) ئەکات کە لە (جیهانێکی ترەوە هاتبوو و بەناو خەڵکدا ئەگەڕاو بە دەنگێکی کاریگەر لەو بەلایە ئاگاداری ئەکردن.)

بەڵگەیەکی تری (ئیقلیم گیری یەتی) ئەم کارەساتە ئەوەیە کە لە هەموو ئەفسانەکان دا (ژن و پیاو) و هەندێک جار منداڵەکانیان ئاگاداری ئەم بەلایە کراون. بۆ وێنە : لە ئنجیل دا (نوح) و ژنەکەی، لە ئەفسانەی ئیرلەندی کۆن دا (پیت) و لە ئەفسانەی یۆنانی کۆن دا (دێڤکالیۆن) و (پیرا) و لە ویڵز (دیوڤین) و (دیوێڤیچ) بەرچاو ئەکەون. هەمان وێنە لەو دیو (ئەتلەسی) دا، لەناو (ئاتسی) و هیندی یە سوورەکانی بەرازیل و سەرووی ئەمەریکادا دووبارە ئەبێتەوە.

شتێکی تر هەموو ئەوانەی ئاگاداری ئەم کارەساتە کراون پێ یان وتراوە کە گیان لەبەری هەمە چەشنە لەگەڵ خۆیان رزگار بکەن ! ((نوح)) ی ((ئینجیل)) و ((ناتا)) ی مەکسیکی کۆن و ((ئیتسی)) هیندی

---

٢ – له قورئانی پیرۆزیش دا بە هەمان شێوە خوا حەزرەتی نوح ئاگادار ئەکات و فەرمانی پێ ئەدات کەشتی یەک دروست بکات . وەرگێڕ

یــەکانی کەنــداو ((مــانو)) ی هینــدی و ((تــرۆو)) ی بۆرنیــۆ و ((کسیسۆترۆس)) ی سۆمەری هەریەکێک لەمانە هەروایان کردوە !

پاش نیشتنەوەی ئاوی لافاوەکە خەڵکەکە لەسەر ((لوتکەی یەکەم شاخ)) دائەبەزن کە دەرئەکەوێ !

لە داستانی ((گەلگامیش)) دا کەشتی یەکە لەسەر لوتکەی شاخی ((ناتسیر)) و کەشتی یەکەی نوح لەسەر لوتکەی شاخی ((ئارارات)) و کەشــتی یەکــەی ((دیڤکــالیۆ)) ی یۆنــانی لەســەر لوتکــەی شــاخی "ئۆفریس" {یان پارناس}و کەشتی دانیشتوانی "ڤاییتی" لەسەر لوتکەی شاخی ((پیتۆخیتۆ)) ئەگیرسێتەوە.

زۆر خاڵی تری لەیەک چوو هەیە کە ناتوانین هۆیەکانیان روون بکەینەوە : (نوح) بۆ ئەوەی بزانێ ئایا لافاوەکە نیشتۆتەوە یان نەء، ناوبەناو (باڵندە) یەک ئەنێرێ. سێ جار باڵندەی نارد و کەلە سێهەم جــاردا گەڕایــەوە چڵــە زەیتــوونێکی بــە دەنوکــەوە بــوو - ئەمــەش نیشانەی کەم بوونەوەی ئاو بوو.

پاڵـەوانی رزگـار بـووی سـۆمەریش، کـە زۆر لـە نـوح کـۆنترە بـە هـەمان شـێوە باڵـندەی نـارد کـە بزانـێ زەوی دەرکـەوتوە یـان نـەء . پاڵـەوانی هینـدی یـەکانی ((وێسـت ئینـدیا)) و ناوەڕاسـت و سـەرووی ئەمەریکاش هەروایان کرد و باڵندەکان چڵێ درەختیان بۆ هێنان وەک بەڵگەی دەرکەوتنی زەوی.

دوو هەزار ساڵ پترە لە ئینجیل دا باسی دەرکەوتنی پەلکە زێڕینە ئەخوێندرێتەوە کە بە نیشـانەی تەواوبوونی ((لافاوەکە)) ئـەژمێردرێ. لەســەر خشــتە قوڕەکـانی سـۆمەریش هـەمان شـت بـاس کـراوە. ئـەی بۆچی هەمان هەواڵ لە پەڕاوە ئاینی و ئەفسانە کۆنەکانی ئەمـەریکا و

پۆلۆنیزیاش دا هەیە ؟ هەروەک لافاوەکەی ئینجیل و سۆمەری یە کۆنەکان لە ئەفسانەی ئەمەریکا و دورگەکانی ئۆقیانووسی ((هێمن)) یش دا پەلکە زێڕینە نیشانەی تەواو بوونی لافاوەکەیە.

لەمەش سەیرتر دەرکەوتنی ((ئاگرە)).

لە ئەفسانەی ((ئاتستیک)) ەکانی مەکسیک دا ((تێلاکاخوان)) ی خواوەند کە ((ناتا و ژنەکەی)) ئاگادار کرد کەشتی دروست بکەن و بەمە لە لافاوەکە رزگاریان بوو ئاگریان کردەوە کە ماسی ببرژێنن. خواکانی تر وایان زانیبوو کە هەموو گیان لەبەرانی سەر زەوی فەوتاون و کە دوکەڵەکەیان بینی زانیان هێشتا چەند کەسێک ماوە و ویستیان ئەوانیش بکوژن، بەلام (تیلاکاخوان) قایلی کردن کە وازیان لێ بهێنن و نەیان کوژن.

(نوح) یش پاش تەواو بوونی لافاوەکە (ئاگر) ی کردەوە و بەمە خوا زانی کە چەند مرۆڤێک رزگاریان بوە!

وەک ئاشکرا بوە زۆربەی باسەکانی ئینجیل لە سەرچاوەی کۆنتر وەرگیراون و زۆریان ئەگەڕێنەوە بۆ سەرچاوە بابلی یەکان بەم جۆرە، لەو سەرچاوانەش دا پاش لافاوەکە (خواکان) لە بۆنی گۆشتە برژاوەکان کۆبوونەوە و زانیان کە خەڵک رزگاریان بوە، و هەروەک خواکانی مەکسیک ئەمانیش تووڕە بوون و ویستیان ئەمانیش لە ناوبەرن، بەلام لێرەش یەکێکیان، کە (ئێیا) بوو، و لەکاتی خۆی دا ئاگاداری روودانی لافاوەکەی کردبوون، فریاکەوت و قایلی کردن کە نەیان کوژن !

بەم جۆرە ئەگەینە ئەو ئامانجەی کە ئەو هەموو لەیەک چوونە دەربارەی لافاوەکە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە بڵێین ئەم کارەساتی لافاوە رووداوێکی راستەقینە و ((ئیقلیم گیر بوە !))

## مردن بە هۆی هێزی ((ژێرەوە))

پەڕاوە (پیرۆزە) هیندی یە کۆنەکان ئەڵێن کە ئەو کارەساتەی هەموو زەوی دووچاری بوو (خایاگریڤۆی) خوا بەسەری دا هێنان کە لە (ناخی زەوی) دا ئەژیا. ئەفسانەی (خالدی) یەکانیش دەربارەی (مەلائیکەتی ناخی زەوی) ئەدوێ.

ئاخۆ ئەم (شت) ە چی بێ کەلە (ناخی زەوی) یەوە هاتۆتە دەرەوە و بە جۆرێکی وا ترسناک جیهانی تێک داوە کە شایانی بیر چوونەوە نەبێ ؟

ئەفسانەیەکی کۆنی یۆنانی دەربارەی (فاتیۆن) واتا تەماوی – ئەڵێ : (فاتیۆنی کوڕی گێلیۆس (خۆر) داوای لە باوکی کرد کە رۆژێک (جڵەوی) عەرەبانەی (رۆژ) ی بداتە دەست، بەڵام چونکە نەیتوانی ئەسپەکانی بە رێگای ئاسایی خۆیان دا (لێخۆڕێ) زۆر لە زەوی نزیک کەوتەوە و هەڵمی لە زەوی هەستاند. ئەوسا (زیۆس) تووڕە بوو و تریشقەیەکی لە فاتیۆن داو بەری دایە خوارەوە بۆ سەر زەوی. هەندێک لە زانایان رایان وایە کە ئەم ئەفسانەیە سەلماندنی کەوتنە خوارەوەی میتیۆرێکی [٣] گەورەیە.

وەک ئاشکرایە، بێجگە لە ئەستێرەکان کۆمەڵەیەک ئەستێرەی گەورە بەدەوری خۆردا ئەسوڕێتەوە کە پێ یان ئەڵێن : ((ئاسترۆید))

---

٣- میتیۆر : Meteoros وشەیەکی یۆنانی یە : پارچە ئەستێرەیەکە لە ئاسمانەوە ئەکەوێتە خوارەوە و ئەگاتە ئاتمەسفێری زەوی .

[٤] زاناکان بۆیان دەرکەوتوە کە ئەگەر ئەم پشتێنە ئاسترۆیدە بخرێتە سەر یەک پلانێتێک [٥] دروست ئەکات تیرەکەی (٥٩٠٠) کیلۆمەتر ئەبێ. زانا ئەسترۆنۆمی یەکان وای دائەنێن کە کاتی خۆی پلانێتێکی وا هەبوە لە مارس بچووکتر و لە میرکۆری گەورەتر بوە و مەدارەکەی لە نێوان مەداری مارس و پۆپیتەردا بوە – ئەم ئەستێرەیە کە بەناوی ئەو (فایتۆن) ەی باسمان کرد ناونراوە لە ئەنجامی کارەساتێکی ئاسمانی بەهێزدا تەقیوەتەوە و لەناو چوە و هەتا ئێستاش چەند پارچەیەکی بەدەوری خۆردا ئەسوورێتەوە کە لەوانەیە لەپاشە رۆژدا ببێتە هۆی روودانی کارەساتێکی پر مەترسی.

ئەمەش بەڵگەی سەلماندنی ئەفسانە کۆنەکەیە :

وەک ئیفلائۆن ئەگێڕێتەوە، پیاوانی ئاینی میسری بە ((سۆڵۆن)) [٦] یان وتوە کە گوایا ئەو ئەفسانەیەی دەربارەی ((فایتۆن)) هەیە لەو راستی یەوە هاتوە کە ئەو پلانێتە لە رێگا ((لا ئەدات)) و پاش ماوەیەکی زۆر خۆی ئەدات بە زەوی دا و ئەیسووتێنێ.

زۆربەی ئەو هەواڵ و چیرۆکانەی دەربارەی ((کارەساتە مەزنەکە)) پێمان گەیشتوون لەوە ئەدوێن کە ((شت)) ێک لە ئاسماندا دەرکەوتوە و دوایی یان کەوتۆتە سەر زەوی یان لێ ی دوور

---

٤ – - ئاسترۆید Aster ئەستێرە + Eidos دیمەن : وشەیەکی یۆنانی یە : ئەو کۆمەڵە ئەستێرەیەن کە لە نێوان مەداری مارس و پۆپیتەردا بە دەوری خۆردا ئەسوورێنەوە . وەرگێڕ

٥ – پلانێت : Planeta وشەیەکی لاتینی یە ((بەمانا سەرەڕۆ)) : ئەستێرەی تاریک کە بەدەوری خۆردا ئەسوورێنەوە و رووناکی لێ وەرئەگرن .

٦ – سۆلۆن : یاساناسی هەرە بەناوبانگی یۆنانی کۆنن ( دەور وبەری سالی 640 – 599 پێش . ز ) .

کەوتۆتەوە. بۆ وێنە : بەشی پێنجەمی کتێبی ((سیبیلی)) [7] ئەڵێ کە ((لەش)) یێکی ئاگرین لە ڕۆژهەڵاتی ئاسۆدا دەرکەوت. تیشکی ڕۆژی داپۆشی و لەوەپاش کەوتە ناو زەریاوە.

ئەفسانە ئیرلەندی یەکان باسی ئەو ((هەورە سەیرە)) ئەکەن کە پاش ((لافاوەکە)) پەیدا بوو و لەیەک پچڕا و کەوتە سەر زەوی و زیانێکی زۆری بەخشی. ڕەنگە ئەو ئەفسانە هیندی یەش هەر دیاردەیەکی لەم چەشنە بێ کە ئەڵێ : ((پاش لافاوەکە حەوت خۆر لە ئاسمان دا دەرکەوتن، لەپاش دا یەکێکیان شەشەکەی تری قووت دا)).

ئایا لەسەر زەوی هیچ نیشانەیەک هەیە کە کەوتنە خوارەوەی ئەم جۆرە ((لەش))انە بسەلمێنێ ؟

بەڵێ !

لە دورگەی ((سائاریم)) ی ئەستۆنیا گۆمی کالیپۆخار (واتا گۆمە پیرۆزەکە) هەیە. زانایان ئەڵێن (٢٥٠٠) ساڵ لەمەوپێش میتیۆرێکی گەورە کەوتۆتە خوارەوە و کە گەیشتۆتە ئاتمەسفێری زەوی پارچەپارچە بوە و لە شێوەی باران دا گەیشتۆتە سەر زەوی. ((دلۆپێک)) لەم بارانە، کە سەنگی نزیکی (٥٥٠) تەن بوە. دوایتی بەو شوێنەدا و چاڵی ئەو گۆمەی دروست کردوە.

ئاشکرایە کە کارەساتی وا گەورە لە یادی مرۆڤایەتی دا ئەمێنێتەوە و دەماودەم ئەگێڕدرێتەوە و لەبیر ناچێتەوە. هەر شتێکی لەم چەشنەشە لە ئەفسانەی هیندی یە سوورەکانی تیرەی ((ناڤاخۆ))

---

٧ - کۆمەڵە پاڵەوانێکی ئەفسانەیی یونانی کۆنی کە گوایا زانیارییان لە ((ئەپۆلۆن)) ەوە وەرگرتوە . وەک ئەگێڕنەوە کۆمەڵە کتێبەکانیان لەکاتی سوتاندنی پەرستگای ((یوپیتەر)) دا لەساڵی ٨٣ پێش. ز دا لەناو چوون. وەرگێڕ

دا جێگیر بوه که ئەڵێ : ((خوا له شێوەی کۆمەڵەیەکی ئاگرین دا لەو دۆڵە دابەزی و هەموو دەور و پشتی خۆی کاول کرد.)) پاش لێکۆڵینەوه دەرکەوت که ئەو شوێنەی ئەفسانەکه باسی ئەکات چاڵێکی گەورەی سەد مەتر قووڵی و کیلۆمەتر و نیوێک خڕی تێدایه که له ئەنجامی کەوتنه خوارەوەی میتیۆرێکی گەورەدا پەیدا بوه.

کەوتنه خوارەوەی ((لەش)) ی ئاسمانی لەم سەدانەی دواییەشدا رووی داوه. بۆ وێنە، له ١٨٦٨ دا ((بارانێکی)) میتیۆری نزیکەی ((١٠٠٠٠٠)) بەردی دا بەسەر شاری وارشۆدا که سەنگی هەندێکیان له ده کیلۆ تێ ئەپەڕی.

له ١٨٤٧ دا بەردێکی ((ئاسمانی)) له بۆهیمیا کەوت بە سەر خانوویەک دا، سەربانەکەی کون کرد و ئەوەندەی نەمابو سێ منداڵ بکوژێ. ئەوەی زانراوه له نێوان سالانی ((١٧٩٠ – ١٩٥٤)) دا ((٢٧٠)) بەردی میتیۆری کەوتوه بەسەر مالان دا.

له ٢٤ ی گەلاوێژی ١٩٣٨ دا لەپڕ ئاسمانی پەنسلڤانیا رەنگێکی سووری ئاگرینی پەیدا کرد و تەقینەوەیەکی زۆر گەورە خەڵکی پیتسبورگی لەخەو راپەڕاند. هەموو وایان زانی که باروت خانەی شار تەقیوەتەوه. له دوایی دا دەرکەوت که ئەمه له ئەنجامی کەوتنه خوارەوەی میتیۆرێک دا رووی داوه که داویه به قەراخ شاردا. ئەگەر ئەم ((لەشه ئاسمانی یه)) به گۆشەیەکی کەمێک لەمه جیاواز بکەوتایه خوارێ شارەکەی وێران ئەکرد و نیو ملیۆن خەڵکەکەی ئەکوشت.

دیاره چەند قەبارەی ((میتیۆر)) گەورەتر بێ زیاتر وێران کاری ئەکات. ئەبێ زیانی ئەم جۆره ((لەشانه)) چەند بێ ؟

زانای ئەستێرەنۆمی بەناوبانگی پۆلۆنی ((یان گادۆمسکی)) لەم ڕووەوە ئەم زانیاریانەی خوارەوەی بڵاو کردۆتەوە :

| تیرەی لەشە ئاسمانی یەکە | ئەو ڕووبەرەی ئەتوانێ وێرانی بکات | بە چەند ساڵ جارێک ڕوودەدات |
|---|---|---|
| ٦٥ مەتر | ((٢٠)) کیلۆمەتر چوار گۆشە | هەر ((٢٢٠٠٠)) ساڵ جارێک |
| ١٣٠ مەتر | ((١٦٠)) کیلۆمەتر چوار گۆشە | هەر ((١٢٠٠٠٠)) ساڵ جارێک |
| ٤٢٥٠ مەتر | نیوەی ئەوروپا | هەر ((٢٦٠)) ملیۆن ساڵ جارێک |
| ٨٥٠٠ مەتر | نیوەی ئاسیا | هەر یەک ملیار ساڵ جارێک |
| ١٧٠٠٠ مەتر | نیوەی هەموو زەوی | هەر ٤/٤ ملیار ساڵ جارێک |

لەبەرئەوەی کە تەمەنی زەوی زۆر درێژە هیچ دوور نیە لە هەموو کاتێکدا ((لەش)) ێکی قەبارە گەورەی پێدا بکەوێ، ئەمەش لەو کاتەدا ڕوودەدات کە یەکێک لە ئاسترۆیدەکان بگاتە سنووری هێزی ڕاکێشانی زەوی و بکەوێ بە سەری دا، دەرکەوتوە کە تیرەی ئاسترۆیدی ((ئیرۆس)) حەڤدە کیلۆمەترە و ((سێرێرا)) ٧٧٠ کیلۆمەترە. ئاشکرایە زەوی چی بەسەر دێت ئەگەر یەکێک لەم

ئاستێرۆیدانەی باسمان کرد بکەوێت بە سەری دا ! وەک گۆڤاری Discovery ئینگلیزی نووسی : ((یەکێک لەم ئاستێرۆیدانە ئەتوانێ هەموو مرۆڤایەتی سەر زەوی لەناو بەرێ !)).

لەسەر زەوی دەیەها جێگا هەیە کە لە ئاسمانەوە ((لەش)) ی پێدا کەوتوە. بۆ وێنە ئەفەریقای خواروو چاڵێکی تیرە (٤٠) کیلۆمەتری هەیە. ماوەیەکی زۆر وا ئەزانرا کە ئەمە دەمی بورکانێکی کوژاوەیە، بەڵام لە دواییدا دەرکەوت کە جێگای کەوتنە خوارەوەی میتیۆرێکی ئاسمانی یە کە پێش نزیکەی ((٢٥٠)) ملیۆن ساڵ بە هێزی زیاد لە هێزی بیست بۆمبای هایدرۆجینی تەقیوەتەوە. میتیۆری ((تونگرس)) یش هەر شتێکی وایە هەرچەندە هەتا ئێستا بەتەواوی روون نەبۆتەوە !

ئەوەی شیاوی باسە زۆر کەمی ئەو میتیۆرانەی ئەکەونە خوارێ ئەگەنە سەر زەوی وشکانی، چونکە لەبەر ئەوەی ٧٠% ی رووی زەوی ئۆقیانوس و زەریایە دیارە زۆربەیان ئەکەونە ئاوەوە و نابینرێن. بێجگە لەمەش، لەماوەی ملیاردەها ساڵی تەمەنی زەوی دا زۆر وشکانی بووە بە ژێر ئاوەوە، و زۆر ناخی زەریا بەرز بۆتەوە و بوە بە زەوی وشکانی، ئەمەش بۆتە هۆی سڕینەوەی نیشانەی کەوتنە خوارەوەی زۆربەی میتیۆرەکان.

لەوە پێش باسمان کرد کە لە کاتی کارەساتی ((لافاوە جیهانی یەکەدا)) ئاوی زەریاکانی قەراغ چین کشاوەتەوە دواوە و لەو دیوی رووی زەوی یەوە، بە پێچەوانەوە، شەپۆلی ئاو بەرز بوەتەوە. ((ن. یۆنیڤ)) ی سەرۆکی روانگەی صۆفیا ئەڵێ کە ئەمە لە ئەنجامی نزیک

بوونەوەی ئاستڕۆیدێکی گەورەوە لە زەوی رووی داوە. لەوە پاش ئەڵێ : ئەگەر ئەو ئاستیرۆیدە گەیشتبێتە دووری شەش ئەوەندەی تیرەی زەوی لێ یەوە وا توانیویەتی ئاو دە ئەوەندەی ((هەڵچوونێک))[8] ی ئاسایی بەرز بکاتەوە، ئەمەش بەس بوە بۆ ئەوەی هیچ شتێک لەسەر ئەو بەشەی زەوی نەهێڵێ.

هەندێک زانا رایان بۆ ئەوەش ئەچێ کە ئەشێ لە ئەنجامی لەیەک دانی زەوی لە گەڵ ((کەمیتا)) [9] یان وەک ((ی. ڤێلیکۆڤسکی)) زانای ئەمەریکی ئەڵێ : لەگەڵ ((کلکی)) کەمێتایەک دا رووی دابێ، تۆ بڵێ ی ماری ئەو ئەفسانەیەی لەبەشی پێنجهەمی کتێبی ((چیلام بالآم)) ی (مای)یەکان دا نوسراوەتەوە مەبەست لەم ((کلکە)) نەبێ ؟ کتێبەکە ئەڵێ : ((بارانێکی ئاگرین باری و خۆڵە مێش زەوی داپۆشی، درەختەکان چەمانەوە و لەگەڵ بەردەکان دا هەموو لەت لەت بوون، ((مارێکی گەورە)) هاتە خوارەوە و لەگەڵ ئاسمان دا دایان بە زەوی دا و لە ناویان برد)).

خۆ ئەگەر لە باتی ((کلکی)) ئەو کەمێتایە ((سەرەکەی)) بکەوێتە سەر زەوی وا کاول کردنەکە لە کەوتنە خوارەوەی ئاستڕۆید کەمتر نابێ. بە پێ ی تاقی کردنەوەکانی زانای ئەسترونۆمی ئەمریکی بەناو

---

٨ - مەبەست لە ((مد)) ی زەریایە .

٩ - کەمیتا : وشەیەکی یۆنانی یە Kometes ئەو ((لەشە)) ئاسمانی یە پچووکانەیە کە لە شێوەی هەورێکی نارێک دا زۆر لە دوورەوە لە مەدارێکی ئیلیپسی دا بە دەوری رۆژدا ئەسووڕێنەوە ، کە لە رۆژ نزیک بوونەوە گاز فڕێ ئەدەن و ئەبنە هۆی دروست بوونی چەند لەشێکی نووساو پێوەی لە شێوەی ((کلک)) دا کە ئەکەونە ئەودیوی دوور لە رۆژەوە . — وەرگێڕ -

بانگ (گ. یوری) کەوتنەخوارەوەی ئەو ((سەر)) ە وزەیەک دروست ئەکات کە ((٥٠٠٠٠٠)) ئەوەندەی بۆمبای هایدرۆجینی ئەبێ.

شتێکی تر، هەندێک زانا رایان وایە کە ئەو ((لەشە)) ئاسمانی یەی لە زەوی نزیک بۆتەوە و گەیشتۆتە ناو هێزی راکێشانیەوە ((مانگ)) بوە !

وەک ئاشکرایە، و ئاسترۆید و ئەستێرە وردانەی بە دەوری رۆژدا ئەسوورێنەوە بگەنە سنوری هێزی راکێشانی ئەستێرەی لە خۆیان گەورەترەوە ئەبنە ((بەند)) ی ئەو ئەستێرە گەورانە. ئەگەر ئەو ئەستێرەیە لەو دیو ((مەدار)) ی ئەستێرە گەورەکەوە بێت وا دەست ئەکات بە سووڕاندنەوە بە دەوری دا بە پێچەوانەی سووڕاندنەوەی میلی سەعاتەوە. نموونەش بۆ ئەم جۆرە سووڕاندنەوانە ((مانگ)) ی تابیعی زەوی و ((یاپیت)) و ((یۆپیتەر – ٧ -)) ی تابیعی ((ساترِوونن)). خۆ ئەگەر ئەو ((لەشە)) لەم دیوی مەداری ئەستێرە گەورەکەوە بێ وا کە بوو بە تابیعی لەگەڵ سووڕاندنەوەی میلی سەعات دا دەست ئەکات بە سووڕاندنەوە بە دەوری ئەستێرە گەورەکە دا. نمونەش بۆ ئەمە ((فیبا)) و ((یوپیتەر – ٨ -)) ی تابیعی ساترونن !

زانای ئەسترۆنۆمی سویدی بەناوبانگ ((هانس ئالڤێن)) لە وتاری ((پەیدا بوونی مانگ و زەوی)) دا [١٠] باسی تیۆریَ ی زانای ئەسترۆنۆمی ئەڵمانی ((هێرستێنکۆرن))ئەکات کە دەربارەی پەیدا

---

١٠ - گۆڤاری ((زانیاری و مرۆڤایەتی)) موسکو 1964 .

بوونی مانگ ئەدویّ. بە وتەی ((هێرستێنکۆرن)) کاتی خۆی مانگ پڵانێتێک بوە لە مەدارێکی وەک مەداری زەوی دا سووڕاوەتەوە، لە دواییدا زەوی ((راپێچی)) کردوە و بەدەوری خۆی دا سووڕاندوویەتیەوە. لەوەپاش وردە وردە لە زەوی نزیک بوەتەوە و تیرەکەی زیادی کردوە و هەتا بیست ئەوەندەی ئێستای لێ هاتوە. ((هانسی ئالڤین)) لەم بارەیەوە لەسەری ئەڕوات و ئەڵێ : ((لە ئەنجامی ئەمەشدا هەڵچوونی ئاو لە زەریاکان دا زیادی کردوە و لە هەندێ کات دا کە مانگ زۆر لە زەوی نزیک کەوتۆتەوە بەرز بوونەوەی ئاوەکە گەیشتۆتە چەند کیلۆمەترێک. ئەمەش لە کاتێکدا روو ئەدات کە دووری مانگ لە زەویەوە بگاتە ٢/٨٦ ی تیرەی زەوی، ئەوساش هێزی راکێشانی زەوی لەسەر رووی مانگ لەهی مانگ خۆی زیاتر ئەبێ. پاش ئەمە مانگ بە هۆی هێزی راکێشانێکی ((نائاسایی)) وردە وردە دوور کەوتۆتەوە و گەڕاوەتەوە شوێنی خۆی.))

بێجگە لە ((هێرستێنکۆرن)) زۆر زانای تریش هەمان رایان هەیە. وەک ((گ. یوری)) ئەمەریکی کە ئەڵێ : مانگ شتێکی نائاسایی یە لە کۆمەڵەی خۆردا، چونکە لەوە گەورەترە کە ببێتە ((تابع)) یێکی ئاسایی. بەڕای ئەو مانگ لە پێش دا پڵانێت بوە و لە ئەنجامی کارەساتێکی ئاسمانی دا بوە بە ((تابع)) ی زەوی. ئەشڵێ کە لەشێکی ئاسمانی زۆر گەورە بە لایدا تێپەڕیوە و لە هێڵی خۆی لایداوە و کە خێراییەکەی کەم بۆتەوە و گەیشتۆتە ئاتمەسفێری زەوی – بە زاراوەی گ. یوری – زەوی ((رفاندوویەتی بۆ خۆی !)).

لەوە ئەچێ زاراوەی ((رفاندن)) بنچینەیەکی هەبێ. هیچ نەبێ لەم دواییەدا رایەکی ((پێچەوانە)) ی ((رفاندن)) یش بەرامبەر ((میر کوری)) پەیدا بوە. بەرای زاناکان ((میر کوری)) خۆی ((تابع)) ی ((ڤینۆس)) بوە و لەپڕ ((خۆی راپسکاندوە)) و بوە بە پلانێتێکی سەربەخۆ !.

سەیر ئەوەیە کە هەندێک ئەفسانەی کۆن ئەڵێن گوایا هۆی کارەسات و لافاوەکە ((مانگ)) بوە ! ئەفسانەی ((کالیڤالا))ی فینلەندی و ئەفسانەکانی خوارووی ئەمەریکا نمونەی ئاشکران بۆ ئەمە.

هەروەها لە ئەفسانەی زۆر میللەتان دا ئەوە ئەبینین کە کاتی خۆی مانگ ((نەبوە !)). دوور نیە تەنها هەر بە رێکەوت نەبێ ئەفسانەکانی ((مای)) – کە ئەگەڕێنەوە پێش لافاوەکە – هیچ باسی مانگیان تێدا نیە. بە پێ ی ئەفسانەی ((مای)) یەکان شەوانی زەوی ڤێنۆس رووناکی کردۆتەوە نەک مانگ !.

هەروەها ئەفسانەی ((بوشمان)) ەکانی خوارووی ئەفەریقاش کە باسی لافاوەکە ئەکەن ئەوە ئەسەلمێنن کە پێش لافاوەکە مانگ بە ئاسمانەوە نەبوە.

ئەفسانەی گەلی ((ئەرکادی)) خوارووی یۆنان ئەوە ئەگەیەنێ کە لە پاش لافاوە کۆنەکە مانگ لە ئاسمان دا دەرکەوتوە، هەر ئەمەش وای لە یۆنانی کۆن کردوە کە بە ئەرکادی یەکان بڵێن ((گەلی پێش مانگ)) !

((ئەپۆڵۆن)) ی رۆدیسی، کە سەرۆکی کتێبخانە مەزنەکەی ئەسکەندەری یە بوو لە سەدەی سێهەمی پێش. ز. دا دەربارەی

نەبوونی مانگ لە ئاسمان دا نووسیویەتی، ئەم زانیاریانەشی لە سەرچاوە و کتێبی دەسنووسی کۆنی زۆر پێش خۆی وەرگرتوە کە لەوە پاش لەناو چوون و بە ئێمە نەگەیشتوون. ((ئەلکسگۆراس)) ی زانای ئەسترۆنۆمی یۆنانیش (سەدەی پێنجهەمی پێش. ز) لە چەند سەرچاوەیەکی کۆنەوە کە ئەویش لەناو چوون و بە ئێمە نەگەیشتوون – ئەڵێ : کە مانگ زۆر پاش دروست بوونی زەوی لە ئاسمان دا پەیدا بوە.

شوێنەواری ((هەڵچوون)) و ((داچوون)) ی ئاوی زەریا لە زۆربەی شوێنی سەر زەوی دا ئەوە ئەگەیەنێ کە چەند ملیۆن ساڵێک لەمەو پێش روویان دابێ. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە تەنها لە ئەنجامی نزیک بوونەوەی ئەو ((لەشە)) ئاسمانی یە دا رووی داوە کە ئێستا ئێمە ((مانگ)) ی پێ ئەڵێین. ئەمەش لە ئەنجامی دۆزینەوەی شوێنەواری میتیۆرێک لە ناوەڕاستی خوارووی ئەمەریکا دا ئەڵێین. رای زاناکان ئەوەیە کە ئەمانە پارچەی لە ناوچووی یەکەم ((مانگ)) ی تابیعی زەوین کە پاش تەقاندنەوەی کەوتوونەتە سەر زەوی.

پارچەی ((لەش)) ی لەم جۆرە تەنها لە ئەمەریکای خوارووادا نەدۆزراوەتەوە. بۆ وێنە، کە لەم دواییەدا ((ج. ل. ڤۆرزێل)) لە ناخی ئۆقیانووسی ((هێمن)) دا چینێکی (٥ – ٣٠) سانتیمەتری خڵتەی ((خۆڵەمێشی)) دۆزیەوە رووبەرێکی ئێجگار گەورەی داپۆشیبوو، و بینی هەمووی لەیەک ئەچێ، گەیشتە ئەو ئەنجامەی بڵێ ئەمە شوێنەواری کەوتنە خوارەوەی پارچەیەکە لە ئاسمانەوە. هەروەها زۆر زانا بوونی شوێنەواری نیکل لە ناخی ئۆقیانووسەکان دا بە

تواوەی پارچە ((لەش)) ی ئاسمانی ئەزانن کە کاتی خۆی کەوتوونەتە سەر زەوی.

بەم جۆرە، زۆر قسە دەربارەی ئەوە کرا کە ئایا هۆی کارەساتی ((لافاوەکە)) مانگ یان کەمێتا یان ئاسترۆید بوە، کە کەوتونەتە سەر زەوی یان زۆر لە نزیکیەوە تێپەڕیون.

ئەوەش گرنگ نیە کە هۆی کارەساتەکە بسەلمێنرێ، بەڵکو بەلای ئێمەوە ئەوە گرنگە کە بڵێین لە مێژوودا کارەساتێکی وا ((رووی داوە)). بێ گومان بوونی چەندەها شوێنەواری مادی بەڵگەن بۆ ئەوە کە کارەساتی وا ((بوە)).

* * * *

هاوینی ١٩٦٨ لە پەرلەمانی ئینگلیزی دا ئەم پرسیارە کرا :

((حوکومەتی بەریتانیا بە تەواوی رای زانا ئەسترۆنۆمە سۆڤێتیەکانی سەلماندوە کە ئەڵێ ئاسترۆیدی ئیکار کە ((١٥)) ی تەموزی ١٩٦٨ ئەگاتە نزیکترین دووری لە زەوی یەوە، لێ ی نادات. باشە، ئەی ئەگەر هات و ئەمە وا نەبوو، و خۆی دا بە زەوی دا حوکومەت هیچ رێگایەکی داناوە بۆ نەهێشتنی ئەم مەترسییە ؟))

ئەتوانین بیهێنینە بەرچاومان کە ئەگەر ئەم ((لەش)) ە ئاسمانی یەی تیرەی لە کیلۆمەترێک زیاترە و بە خێرایی ((١٠٠٠٠٠)) کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا ئەسوورێتەوە بیدایە بە زەوی دا چی مەترسی و وێران کارییەک لەسەر رووی زەوی ئەدا.

ئەو مەترسی یەی وای کرد ئەم پرسیارە بکرێ هەر ئەو مەترسی یەیە کە زۆر لە کۆنەوە مرۆڤایەتی تۆقاندوە. هەزارەها ساڵ پاش

لافاوەکە میللەتان هەر وایان زانیوە کە زەوی لە ژێر پێ یان دا چەسپ نیە و مەترسی هەیە، بۆیە سەیر نیە ((ئاری)) یەکان، کە لە شوێنێکی نەزانراوەوە هاتبوونە هیندستان لە خوا ئەپاڕانەوە کە ((زەوی توند بگرێ !))

بە درێژایی ژیانی، گەلی ((مای)) مەترسی دووبارە بوونەوەی کارەسات و لافاوەکەی لە دڵدا بوە. لە زۆر جێگای تەورات و ئینجیلیش دا ئەم مەترسی یە بەدی ئەکرێ. لە شوێنێکدا ئەڵێ : ((خۆر ئەکوژێتەوە و مانگ روناکی نادات و ئەستێرەکان ئەکەونە خوارەوە و ئاسمان ئەشڵەقێ. کەسیش نازانێ ئەمە کەی روو ئەدات..))

نووسراوە بابلی یەکانیش لەم باسانە خاڵی نین، لە ((تەلمود)) دا دەربارەی ئەمە نوسراوە، کتێبە پیرۆزەکانی هیندی یە سوورەکانی ((پوران)) یش ئەڵێن کە رۆژێک دێت زەوی ((رۆئەچێت)) و لەژێر ئاودا نوقوم ئەبێ. ئەشتوانرێ بزانرێ کەی ئەمە روو ئەدات. ((ماخابخاراتا)) دەری ئەخات کە لەپاشە رۆژدا شەپۆلی لافاوێکی نوێ هەموو روو زەوی دائەپۆشێ.

لە سەدەی شەشەمی پێش. ز دا پیاوە ئاینی یە میسریەکان بە ((سۆلۆن)) ی فەیلەسوفیان وتبوو : ((ئێوە هەر دەربارەی یەک لافاوتان بیستوە، بەڵام پێش ئەوەش لافاوی زۆری تر رووی داوە. جارجار ئەو شارستانیەتەی لەسەر زەوی هەیە، هەر وەک شارستانیەتی گەلانی رابردوو، بە هۆی باران و لافاوەوە لەناو ئەچێ. لە رابردوودا کارەساتی وا زۆر رووی داوە و لەمەودواش هەر رووئەدات.))

هەندیک نووسەرانی کۆن وتویانە گوایا کارەساتی وا لە کاتی یەک لە دوای یەکی دانراودا رووئەدات و ماوەکانیشیان پیشان داوە. بۆ وێنە : ((سێنزیریۆس)) ی مێژوو نووسی رۆمای سەدەی سێهەمی پێش. ز – نووسیویەتی کە هەر (٢١٦٠٠) ساڵ جارێک کارەساتی وا بەڵا تووشی زەوی ئەهێنێ. هەموو ئەم باسانەش ئەوە ئەسەلمێنن کە رۆژێک لە رۆژان کارەساتێکی ئاسمانی وا رووی داوە و ئەمەش وای لە مرۆڤایەتی کردوە بیر لەو رایانە بکاتەوە کە باسمان کردن.

* * * *

## ((ئەستێرەکان لە ڕێ لائەدەن))

لە سەدەی شازدەهەمدا وەزیری ئیسیوتی ((مارتین مارتینووس)) چوو بۆ چین و چەند ساڵێک لەوێ مایەوە و زمانەکەیان فێر بوو، و کە گەڕایەوە پەڕاوێکی گەورەی بە ناوی ((مێژووی چین)) دوە نووسی. لەچەند سەرچاوەیەکی دەستنووسی چینی کۆنەوە دەربارەی ((لافاو)) دکە ئاوای نووسی : ((کۆڵەکەکانی ئاسمان کەوتن. زەوی هەتا قووڵایی ناخی کەوتە لەرزین، ئاسمان بەرەو باکوور ترازا، ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەکان لە ڕێگای خۆیان لایان دا و هەموو گەردوون شێواو و ڕۆژ گیرا !))

هەر لەم بارەیەوە، واتا لەبارەی گۆڕینی شێوەی ئاسمانەوە ((تێرنسی ڤارۆن)) کە یەکێکە لە بلیمەتترین ((کۆن ناس)) ی ڕۆمای کۆن لەچەند دەستنووسێکی کۆنەوە نوسیویە : ((ئەستێرەی ڤینۆس بە جۆرێکی وا شێواو ڕەنگ و قەبارە و هێڵی سووڕاندنی گۆڕا کە نەلەوە پێش و نەلەوە پاش دووبارە نەبۆتەوە.)) جوولەکەش لەم بارەیەوە ئەڵێ : ((لافاوەکە لە ئەنجامی ئەوەدا ڕووی دا کە خوا ((ئاڵوگۆڕ)) ی بە شوێنی دوو ئەستێرە کرد.)) ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە زۆر لە ئەفسانەکان هۆی کارەساتی لافاوەکە ئەگێڕنەوە بۆ گۆڕینێکی ((فەزایی)). ئەگەر ئەمە بسەلمێنین ئەتوانین هۆی پەیدا بوونی ئەو سەرما و تاریکیانە تێ بگەین کە بە پێ ی ئەفسانەکان، لەپاش لافاوەکە پەیدا بوون.

زۆربەی گەلانی دۆرگەکانی ئۆقیانووسی ((هێمن)) ئەمە وەک ((تاریکیەکی بێ وێنە))، ((شەوە زەنگ))، و ((تاریکیەکی نەبینراو)) باس ئەکەن.

لە ((تەلمود)) دا ئەڵێ کە پاش لافاوەکە و دەرکردنی مرۆڤ لە بەهەشت ((رۆژ خۆی شاردەوە)). لەوە پاشیش ئەڵێ : ((لە ترسا دڵی ئادەم هاتە لەرزین و ووتی : ئەی هاوار بەماڵم، لە تاو گوناهی من روناک کەرەوەی جیهان خۆی شاردەوە و گەردوون شێوا.))

ئەو ((هێرنستێنکۆرن)) ەی باسمان کرد ئەڵێ : کە لەکاتی نزیک بوونەوەی مانگ و رۆژ لەیەکتری ((تۆز)) ێکی زۆری سەرمانگ لە نێوانیان دا بڵاو بوەوە و بەرەبەرە نیشتە سەر زەوی و بەری رۆژی گرت و تاریکی کرد.

پەیدا بوونی چینێکی ئەستووری تۆز و خۆڵ لەسەر ئاتمەسفێری زەوی دیاردەی تریش پەیدا ئەکات، ئەویش ئەو سەرما لە پڕەیە کە پاش کارەساتەکە پەیدا بوە و لە ئەفسانەی زۆربەی گەلانی کۆن دا باس کراوە.

((پەپۆل ڤووخ)) ئەڵێ : ((پاش لافاوەکە هەموو جیهان بوو بە سەهۆڵ بەندان و رۆژ دیار نەما.)) ئەفسانەکانی مەکسیکی کۆن و ڤەنزوێلا ئەڵێن : ((یەکسەر پاش لافاوەکە سەرمایەکی ترسناک پەیدا بوو و زەریاکان سەهۆڵ داپۆشین)). خێڵەکانی ناوچەی ((ئامەزۆن)) هەتا ئێستاش باسی ئەو زستانە درێژ و ترسناکە ئەکەن کە پاش لافاوەکە هات و مرۆڤ لە سەرمان دا رەق ئەبوونەوە و ئەمردن.

پەڕاوی ((زەند – ئاوێستا)) ش باسی ئەو تاریکیە ئەکات کە باڵی بەسەر وڵاتە رەنگینەکەی باپیرانی ((ئاری)) دا کێشا و بوو بە هۆی پەیدا بوونی بەستەڵەک و سەرما. ((زەند – ئاوێستا)) ئەوەش ئەڵێ کە گەلی ((ئاری)) ئاگاداری هاتنی ئەو سەرمایە کراون : ((زستانێکی کوشندەی وادێت هەموو جیهان ئەیبەستێ.. و بەفر ئەوەندەی درێژی چواردە پەنجە بەرز ئەبێتەوە و جیهان دائەپۆشێ.))

((ج. هەمفری)) دانای بەناو بانگی ئاتمەسفێر لە پەڕاوی ((فیزیای هەوا)) دا باسی پیس بوونی هەوا ئەکات ئەوە روون ئەکاتەوە کە ((تۆز و خۆڵ)) ی بورکانی کارێکی گەورە ئەکاتە سەر گۆڕینی گەرمایی زەوی و هەندێک لەو ((تۆز و خۆڵە)) ئەتوانێ (٣٠) جار زیاتر تیشکی رۆژ بداتەوە لەوێ کە بتوانێ گەرمایی بهێڵێتەوە. ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە لە ئەنجامدا (٣٠) جار زیاتر گەرمایی وون ئەکات لەوەی گلی بداتەوە. بەم جۆرە بۆ ئەوەی ٢٠% ی هێزی تیشکی رۆژ لەسەر زەوی کەم بکرێتەوە ئەوە بەسە کە ١ / ١٧٤ کلم ٣ ((تۆز و خۆڵ)) بڵاو بکرێتەوە.

ئەمە ئەتوانرێ لە ئەنجامی تاقی کردنەوەکانی ئەم دواییەدا بسەلمێنرێ. تەقینەوەی بورکانێکی ئالاسکا کە ((تۆز)) ی بورکانی بەهەوادا بڵاو کردەوە بۆ چەند ساڵێک پلەی گەرمایی هەموو سەر زەوی نزم کردەوە. ئاخۆ ئەو کۆمەڵە بورکانانەی لەکاتی لافاوەکەدا تەقیونەتەوە چیان بەسەر زەوی هێنابێ ؟

زۆربەی ئەفسانەکان کە باسی کارەساتی لافاوەکە ئەکەن باسی ئەو (شاخانە) ئەکەن کە تەقیونەتەوە و ئاگریان بردوە بە ئاسمان دا. دیارە لە ئەنجامدا قەبارەیەکی ئێجگار زۆر تۆز و خۆڵەمێشیان فڕێ داوەتە دەرەوە، ئەمەش، وەک زۆربەی نوسراو و ئەفسانە کۆنەکان باسی ئەکەن، بۆتە هۆی نزم کردنەوەی پلەی گەرمایی بە رادەیەکی ترسناک.

دووریش نیە کە ئەمە تاکە هۆی سەرما و گەرما نەبێ، هۆیەکی تری ئەمە لەوانەیە گۆڕینی شوێنی ((قوتب)) ی زەوی و گۆشە لاریەکەی بێ بە گوێرەی ((مەدارەکەی)). دۆزینەوەی شوێنەواری خەڵووزی بەردین لە ((ئەنتراکتید)) و ((شپیسبێرکین)) و نزیک قوتبی

باشوور بەڵگەیە بۆ ئەوەی کاتی خۆی قوتب لەم ناوچەیەوە دوور بوە.

دۆزینەوەی تریش ئەمە ئەسەلمێنێ. لە ناوچەی قوتبی باکووردا پاشماوەی بە خەڵوز بوونی درەخت و گەڵای وایان دۆزیوەتەوە کە پێش (٢٠٠ – ٢٥٠) ملیۆن ساڵ لەو ناوچانە ژیاون.

بە پێ ی بیرورِای هەندێک لە زانایان (٦٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمە پێش قوتبی باکوری لە شوێنی ئێستای ئۆقیانووسی ((هێمن)) بوە. ئاشکرایە ئێستا قوتب بە جووڵاندنێکی زۆر کەم بەرەو کەنەدا ئەڕوات، ئەم جووڵاندنەش نیشانەی کارەسات و رووداوی ترسناکی پاش چەند ملیۆن ساڵێکی ترە.

قوتبی موغناتیسیش بە هەمان شێوە ((ئەجووڵێ)). ئاشکرایە کە پێش (٧٠٠٠٠٠) ساڵ لەپڕ ((موغناتیسی زەوی)) ئاڵوگۆڕی کرد و باکوور بوو بە باشوور ! وەک دوکتۆری ماتیماتیکی فیزیا ((أ. ڤلاسۆڤ)) ئەڵێ : قوتبە موغناتیسیەکان لە کاتی ((جێ گۆڕکێ)) یان دا بە رێگای جیاجیادا ئەڕۆن. هەندێ جار بەناو یابان دا و هەندێک جار لە ((کەمچاتکا)) وە ئاڵوگۆڕ ئەکەن. دواجار لە پێش ئەوەی قوتبی باکووری موغناتیسی دۆخی ئێستای وەربگرێ دەورەیەکی گەورەی کردوە بە ئۆقیانووسی ((هێمن)) و ئۆقیانووسی ((سەهۆڵ بەندان)) دا.

هەندێک زاناکان ئەوەش ئەڵێن کە زۆرجار ((لەپڕ)) قوتبە مۆغناتیسیەکان ((ئەجووڵێن))، هەروەها تەوەرەی زەویش زۆر چەسپ نیە و لە ((جووڵە)) دایە و لە ماوەی هەر (٤٠٠٠٠) ساڵێکدا گۆشەی لاری یەکەی ئەگۆڕێ، وە لەماوەی هەر (٢١٠٠٠) ساڵێکدا ((جووڵەیەک)) ئەکات. بێ گومان گۆڕینی لاری تەوەرەی زەوی گۆشەی ئاراستە کردنی تیشکی رۆژیش بۆ سەر زەوی ئەگۆڕێ و لە

ئەنجامی ئەمەشدا ئاو و هەوای چەند جێگایەکی سەر خڕۆکی زەوی ئەگۆڕێ.

مـەداری زەویـش گـۆڕینی بەسـەردا دێـت. زانایـانی جیۆلـۆجی گەیشتوونەتە ئـەو بڕوایـەی کـە هـەر (٩٢٠٠٠) سـاڵ جارێـک شـێوەی سـووڕاندنەوەی زەوی بـەدەوری ڕۆژدا ئـەگۆڕێ و لـێ ی نزیـک ئەبێتەوە و لێ ی دوور ئەکەوێتەوە.

بەم جۆرە، دۆخـی زەوی لـە فـەزادا هەمیشـە وەک یـەک نیـە و لـە گۆڕیندایە بەهەموو ئاو، و هـەوا و شـێوەکانیەوە. بێ گومـان زۆربـەی ئـەم گۆڕینانـە ئەوەنـدە کـەم و بێ هێزن کە نابنـە هـۆی پەیـدا بـوونی کارەسات.

لێرەدا ئـەو پرسـیارە دێتـە گـۆڕێ کـە ئاخـۆ چـی بـووبێ بـە هـۆی گـۆڕینی شـوێنی قـوتبی زەوی ؟ لەئـەنجامی لێکۆڵینـەوەکانی زانـای سـۆڤێتی ((گ. د. خیزانـا شـڤیلی)) دا دەرکـەوتوە کـە ((تـەوەرەی سووڕاندنەوەی زەوی هەمیشە لەگەڵ تەوەرەی گـەورەترین (مـەمێنتی ئینێرسیا)) [1] دایە و گۆڕینی شوێنی هـەموو جۆرە قەبارەیـەکی سـەر زەوی گەورەترین ((مەمێنتی ئینێرسیا)) ئەگۆڕێ، لـە ئـەنجامی ئەمـەش دا دیـارە گۆشـەی تـەوەرەی سـووڕاندنەوەی زەویـش ئـەگۆڕێ و بەمـەش قوتبـەکان لـە جێ ی خۆیـان نـامێنن، ئەمـەش کاتێک وای لـێ دێت کە جووڵاندنێکی جیولۆجی گەورە ڕوو بدات.

بەم جۆرە، کە قـەبارە هەشـت کیلۆمـەتری یەکـەی شـاخی هیمالایا دروست بوو، و چەنـد پلەیـەک گۆشـەی لاری تـەوەرەی زەوی گـۆڕی بەمـە جێگـای قوتبـەکانیش گـۆڕا. لـە ئـەنجامی ئەمـەش دا ڕووبـەرێکی

---

١ - مـەمێنتی ئینێرسـیا ئـەو هێزەی ئەبێتە هـۆی جووڵانـدنی ((لـەش)) یێکی وەسـتاو یـان گۆڕینی شێوەو و ئاستی ((لەش)) یێکی جووڵاو و ((جووڵە)) یەکی نوێ ئەداتێ . وەرگێڕ

فراوانـی زەوی پـڕ دارسـتانی چـڕ و گیـان لەبـەر بـوو بـە بیابـانێکی سـەهۆڵ بەنـدانی بـێ گیـان. پەیـدابوونی ئـەم قـەبارە گەورەیـەش لـە ئەنجامی هەڵچوونی شەپۆلی زۆر گەورە و بەهێزی ئاودا رووی داوە و ئەمـەش بۆتـە هـۆی گـۆڕینی تـەوەرەی سـووڕاندنەوەی زەوی و شوێنی قوتبەکان. بۆیە ئەتوانین بە دڵنیایی یەوە بڵێین کە رۆژێک لە رۆژەکان جێگای قوتبەکان ئەمەی ئێستا ((نەبوە)) ! ئەی کوێ بوە ؟ بە رای زانای جێوفیزی ئەمـەریکی ((أ. ئۆکێلی)) قوتبی باکوور کاتی خـۆی لەسـەر هێڵـی پـانی ((٦٠)) پلـەی ژوورو بـوە، واتـا ((٣٠)) پلـە خـوارووی جێگـای ئێسـتای. لێـرەدا گرنـگ ئەمەیـە کۆتـایی چـاخی ((سـەهۆڵ بەنـدان)) لەگـەڵ ئـەو کاتـەدا یـەک ئەگرێتـەوە کـە کارەسـاتی لافاوەکەی تێدا روویداوە!

ئەگـەر ئەمـە وا بـێ، زۆر راسـتی کـە روون کردنـەوەیان شـتێکی سەیر و گرانە ئەبنە شتێکی ئاسایی و ((واقیعی)) بۆ وێنـە : لـە ((زەنـد – ئاوێسـتا)) دا نوسـراوە کـە لـە نیشـتمانی سـەرەتایی ((ئـاری)) یـە کۆنەکان دا رۆژ و مانگ و ئەستێرە ساڵی تەنها جارێک هـەڵهاتوون و ساڵ بریتی بوە لە ((یەک رۆژ و یەک شەو)) !

ئاشکرایە کە ئـەم دۆخـە، واتـا کـە سـاڵ بریتـی بێ لەیەک شـەو و یـەک رۆژ، تـەنها لـە نزیـک قوتبەکانـەوە رووئـەدات. لـە پـەڕاوی ((سرروودە پیرۆزەکـان)) ی ((ریگڤێدا)) شـدا، کـە ئـاری یـەکان لەگـەڵ خۆیان دا هێناویانە بۆ هیندستان هەمان شت نوسـراوە. لەو پەڕاوەدا ئەڵێ کە ئەستێرەی ((ورچـی گـەورە – الدب الکبیـر)) هەمیشـە لەسـەر تەوقی سـەر بینراوە و ئەسـتێرە هـەبوە بە بازنـەیی بـەدەوری خۆردا سووڕاونەتەوە و خۆر ساڵی تەنیا جارێک دەرکەوتوە و هتد..)).

به یارمەتی ئەو باسانەی لە پەڕاوە ئاینییەکاندا هەن و هەزارەها ساڵ بە بێ گۆڕان ماونەتەوە ئەتوانین شێوەی جیهانی ئەوسا بزانین و نەخشەیان بۆ بکێشین. یەکێک لە هەرە گرنگترینی ئەم نموونانە ((سەعات)) ەکانی میسری کۆنن. ((سەعات سازەکان)) ی میسر هەمیشە کورتی و درێژی رۆژیان بە ((١٢ و ١٤)) سەعات داناوە، لە کاتێکدا ئەم رێژەی ((کاتە)) لە هیچ جێگایەکی خاکی میسردا، لەوپەڕی دەسەلات و فراوانیش دا نەبوە. ئەم رێژەی ((کورتی و درێژی)) رۆژە تەنها هەتا سنووری هێلی (١٥) پلە پانی خوارووی زەوی پردە کات، ئەم هێڵەش ئێستا (١٠٠٠) کیلۆمەتر لە دوورترین جێگای سنووری خوارووی میسرەوە دوورە.

ئەی کەواتە ئەو سەعاتانەیان بۆچی وا دروست کردوە؟

یەکێک لەم دوو هۆیەی خوارەوە بەدەر نیە :

یان ئەو سەعاتانە لە نەژادا میسری نین و لە لایەن ((شارستانیەتێکی)) تری نزیک هێڵی ئیستیواوە دروست کراوە (ئەو شارستانیەتەی هیچ شتێک دەربارەی نازانین).

وەیان ئەو سەعاتانە لە کاتێکدا دروست کراون کە بەراستی رێژەی درێژی و کورتی رۆژ لە میسردا وابوە، واتا هێڵی ((ئیستیوا)) لە میسرەوە زۆر لە ئێستا نزیکتر بوە، ئەمەش تەنها لەو کاتەدا ئەشێ وابێ کە جێگای قوتبەکان ئەوە نەبووبێ کە ئێستا هەن !

ئەگەر ئەمە وابێ و لە ئەنجامی کارەساتێکدا قوتبەکان شوێنیان گۆڕابێ، کەواتە ئەوەش رێ ی تێ ئەچێ کە زۆر شتی تر لەسەر رووی زەوی گۆڕابێ.

لە شوباتی ١٩٦٠ دا (أ. دانژۆ)) سەرۆکی روانگەی پاریس، ئەندامانی ئەکادیمی فەرەنسی بەم هەواڵە سەیرە سەرسام کرد : ((لە

ئـەنجامی تەقینەوەیـەکی سـەر رۆژدا کـاتی سـووڕاندنەوەی زەوی ٨٥%. ((میلی سـانیە)) [٢] خاوبۆتـەوە. دوای ئەمـەش وەک ویسـتبێتی ئەو ((دواکەوتنە)) بگێڕێتەوە لەپڕ هـەر (٢٤) سەعات ٣/٧ میلی سانیە خێراتر سووڕاوەتەوە.

ئەگەر تەقینەوەیەکی سەر رۆژ کە (١٥٠) ملیون کیلۆمەتر لێمانـەوە دوورە هێنـدە کـار بکاتـە سـر زەوی ئـاخۆ لەئـەنجامی کارەسـاتێکی گەورەی ئاسمانی دا چی گۆڕینێکی سەرەکی رووی دابێ ؟

رۆژ ژمێرێکی سـەیر، کە لـە کەلاوەکانی شـاری ((تیاخوانـاکۆ)) ی سەرشاخی ((ئاند)) دۆزراوەتەوە کەمێک ئەمەمان بۆ روون ئەکاتـەوە. لە ئەنجامی شی کردنـەوەی نهێنـی پیتـەکانی دا لـە لایـەن ((خ. بلامـی)) یەوە راسـتی یـەکی سەرسوڕ هێنـەر دەرکەوتوە، ئـەویش ئەوەیـە کـە ساڵی ئەو رۆژ ژمێرە بریتی یە لە (٢٩٠) رۆژ !

زۆر ئاین و زانیاری یە فەلسەفی یە کۆنـەکان ئـەوە دەرئەخـەن کـە ئـەو کارەسـاتەی باسـی ئەکـەین یەکـەم کارەسـات نیـە لەسـەر زەوی. ئەگەر ئەمە وابێ راستی یەکی تریشمان بۆ روون ئەبێتەوە.

((مـای)) یـەکان بێجگـە لـەو رۆژ ژمێـرە ئێجگـار راسـتەیان کـە زۆر لـەو رۆژ ژمێـرەی ئێسـتا بـەکاری ئـەهێنین راسـترە، رۆژ ژمێرێکـی تریشیان هـەبوو کـە نـازانین کـەی و چۆن دروست کراوە و پێ یان وتوە ((رۆژ ژمێری پیرۆز)) — لـەو رۆژ ژمێرەدا سـاڵ بریتـی بوە لـە (٢٦٠) رۆژ.

ئایا ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنێ کە ئەوسـا زەوی بـە (٢٦٠) رۆژ جارێک بەدەوری رۆژدا سووڕاوەتەوە ؟

* * * *

---

٢ - میلی سانیە 1 / 1000 ی سانیەیەک .

## کەی کارەساتەکە رووی داوە ؟

یادی لافاوو بومەلەرزە کوشندەکانی پاش ئەوە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی لەبیر نەچۆنەوە و کارەساتی لەوە بچووکتر ئەو یادەی پتر چەسپاندوە، بۆ وێنە، لە دەوروبەری ساڵی (١٤٥٠) ی پێش. ز دا ئاوی ئۆقیانووسی ئەتڵەسی هێرشی هێنا بۆ زەریای سپی ناوەراست کە هەتا ئەوسا ئاستی ئاوەکەی لە ئاستی ئاوی ئۆقیانووس نزمتر بوو، و لە گەڵیدا تێکەڵاو بوو. لە ئەنجامی ئەمەش دا لەپڕ رووبەرێکی زۆر لە وشکایی زەوی بوو بە ژێر ئاوەوە و دانیشتوانیان لەناو چوون. لە نەخشەیەکی زەریای ((ئیجە)) دا کەلە نەخشەیەکی زۆر لەوە کۆنتر وەرگیراوە (وێنە ٣) بێجگە لەو دۆرگانەی ئێستا هەن ژمارەیەکی زۆر دۆرگەی تری لەسەر نیشان دراوە (وێنە ٤) کە ئێستا شوێنەواریشیان دیار نیە.

بەرای هەندێک لە زانایان ئەم نەخشەیە شێوەی زەوی کاتی پێش تێکەڵاو بوونی ئاوی ئۆقیانووسی ئەتڵەسی و زەریای سپی ناوەراست دەرئەخات، ئەو کاتەی، کەوەکو (پلینێیا) ئەڵێ قوبرس و ئاسیا بە وشکانی بەیەکەوە بەسترابون.

ئەی ئاودڕگەی ((باب المندب – کە واتای دەرگای فرمێسک)) ە [1] بۆچی وا ناونراوە ؟ ئەفسانەیەکی کۆن ئەڵێ : ((لەیادی بوومەلەرزەیەکی بەهێز کە ئاسیای لە ئەفەریقا جیا کردەوە و زەریای

---

١ – نووسەر بەم مەعنایەی ترجومە کردوە بۆ رووسی . وەرگێر

سووری دروست کرد و ژمارەیەکی زۆری خەڵک کوشت ئەم ناوەی لێ نراوە !))

کارەساتی لەم جۆرە لەم سەدانەی دواییەش دا روویان داوە. لە ساڵی ١٨١٥ دا لە شارێکی ئەندەنووسیا لەپڕ بورکانێک تەقیەوە و لە (١٢٠٠٠) کەسی دانیشتوانی تەنها (٢٦) کەس رزگاریان بوو. لە ئەنجامی بوومەلەرزە بەناو بانگەکەی ((لیشبۆنە)) دا کە لەساڵی ١٧٧٥ دا رووی دا بە شەش دەقیقە (٦٠٠٠٠) کەس مرد، لەرینەوەی ژێر زەوی لە زۆر جێگای تری ئەوروپا و ئەمەریکا رووی داو لەهەمان رۆژ و سەعات دا لە مەکسیک لەپڕ زەوی قڵیشێکی گەورەی تێ بوو و شارێکی دە هەزار کەسی ((قوت دا)) و پاش ئەمە قڵیشەکە هاتەوە یەک !

لە ١٩٠٢ دا دانیشتوانی پایتەختی دورگەی ((مارینیکا)) هاژەیەکی ترسناکیان گوێ لێ بوو، کە سەریان هەڵبڕی هەورێکی تەنکیان بەسەر لوتکەی شاخە نزیکەکەوە بینی کە لەوە پێش بورکانێکی کوژاوەی لێ بوو. ئەمە دواشت بوو کە بینیان، چونکە هەورێکی پڕ لە غازی ئاگرین جۆشی خوارد و دای بەسەر شارەکەدا و بەچاو تروکاندنێک هەموو (٣٠٠٠٠) دانیشتوەکانی مردن، زۆر لە رۆژنامەکانی ئەو رۆژە باسی ئەو تاکە پیاوەیان نووسی کە لە بەندیخانەی شاردا چاوەڕێ ی مردنی ئەکرد و دیوارە ئەستوورەکانی ژوورەکەی رزگاریان کردبوو !

دیارە هەموو رووداوێکی وا یادی کارەساتە مەزنە ترسناکەکە لە مێشکی هەموو گەلانی سەر زەوی دا زیاتر جێگیر ئەکات، بۆیە

زانینی کاتی روودانی ئەو کارەساتە جیهانی یە ئاسان نیە، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵ ئەدەین بەهۆی ئەمانەی خوارەوە بیزانین :

١ – بە هۆی کلیماتالۆجیاوە : زانایانی سۆڤیتی ((ف. أ. ئەبروچێڤ)) و ((ی. م. خاکیمبیێستەر)) ئەڵێن کە کۆتایی دواجاری سەهۆڵ بەندان لەبەشی ژووررووی زەوی دا لەو کاتەدا بوە کە ((وشکایی یەک کەوتۆتە ناو ئۆقیانووسی ئەتڵەسی یەوە.))

ناوبەناو هەندێک دۆزراوە ئەگاتە دەست زانایان کە ئەیسەلمێنن گوایا لە کۆن دا لە ئۆقیانووسی ئەتڵەسی دا وشکانی هەبوە. بۆ وێنە : گۆڤاری سوێدی (ئیمێر) وتارێکی ((پ. ڤ. کولین)) ی بڵاو کردەوە کەباسی ئەوە ئەکات چۆن لە قووڵایی (٣٦٠٠) مەترەوە خاکی لە ناخی ئۆقیانووسی ئەتڵەسی دەرهێناوە و لە ئەنجامی تاقی کردنەوەدا نیشانەی رووەکێکی تێدا دۆزیوەتەوە کە هەرگیز ناشێ لە ئاوی سوێردا بژی. یەکەم روون کردنەوەی هۆی ئەمە ئەوەیە کە بوترێ لەکاتی خۆی دا شوێنی ئەم دۆزینەوەیە وشکانی بوە.

لە ١٨٩٨ دا کارکەرانی پاپۆڕێکی فەرەنسی کە خەریکی چاک کردنەوەی کێبڵێک بوون کە بەسەر ناخی ئۆقیانووسی ئەتڵەسی دا رۆیشتوە، لەپڕ، بەرێکەوت، پارچە بەردێکی بورکانی یان دەرهێنا. زاناکان ئەمەیان لا سەیر بوو، و دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوەی. لە ئەنجامدا بۆیان دەرکەوت کە ئەو بەردە تەنها لەسەر رووی زەوی و لە ئاتمەسفێری زەوی دا دروست ئەبێ. تەمەنی ئەم پارچەیەشیان بە (١٣) هەزار ساڵ پێ.ز. دانا.

وەک ئاشکرایە کۆتایی دواجاری سەهۆڵ بەندانی ئەوروپا ئەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری (١٠) هەزار ساڵ پێ.ز.

واتا، ئەبێ ئەو کارەساتەی بوە بە هۆی ڕۆچوونی زەوی وشکانی ئۆقیانووسی ئەتڵەسی، لە نێوان ئەم دوو مێژوەدا ڕووی دابێ.

هەمان مێژووی ڕۆچوونی وشکانی ((ئەتلانتیت)) لە لایەن ((ئیفلاتوون)) ەوە نووسراوە : (٩٥٧٠) ساڵ پێ.ز. واتا هەمان ساڵانی دە هەزاری پێ.ز.

بە بیروڕای ژمارەیەک لە زانایان، لە دەوروبەری (١٠٠٠٠) ساڵ پێ.ز. دا گۆڕینێکی تری ئاو و هەوای زەوی ڕووی داوە، ئەویش بەرز بوونەوەی لەپڕی ڕادەی شێ یە !

٢ – بە هۆی هایدرۆگرافیاوە[٢] : وەک ئاشکرایە تاڤگەی نیاگارا لەچەند ((پلیکانە)) یەکی بەردین پێک هاتوە کە ماوەیەکی دوور و درێژ تەوژمی ئاوی لێ داوە. کە پلەیەک بە ئاو شۆراوەتەوە و لووس بوە ئاوەکە بە تیژی کەوتۆتە سەر پلەیەکی تر و بەمجۆرە، زانایان بۆیان دەرکەوتوە کە تاڤگەی نیاگارا لە ئەنجامی گۆڕینێکی جیولۆجی، لەپڕ لەم ناوچەیەدا، لە دەوروبەری ساڵانی هەزارەی (٨ – ١٣) پێ.ز. دا پەیدا بوە.

٣ – بە هۆی ئارکیۆلۆجیاوە : لەم دواییەدا زانای بەناوبانگی مەکسیکی ((هاریسا پایۆنا)) لە ((کۆردیلێر)) لە بەرزایی (٥٧٠٠) مەتردا لەژێر چینێکی ئەستووری سەهۆڵ دا پاشماوەی دوو کۆخی دۆزیەوە ! پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر دەرکەوت کە کاتی خۆی ئەم بەرزاییە لەسەر ڕۆخی زەریا بوە و زیاد لە دە هەزار ساڵ لەمەوبەر ئەم زەویە لە زەریا بەرز بۆتەوە و ئەم شاخانە دروست بوون !

---

٢ – هایدرۆگرافیا : وشەیەکی یۆنانی یە : hydor ئاو ، شێ + grapho ئەنوسم . زانیاری دەربارەی پەیدا بوون و قەبارەی ئاوی سەر زەوی ، وەک ڕوبار و گۆم و زونگاو و نەخشە کێشانیان لەسەر ئەتڵەسی جیهان . وەرگێر

زانای هەرە بەناوبانگی ئەمەریکی و خاوەنی خەلاتی نۆبل ((و. ف. لیبـی)) پـاش لێکۆڵینەوەیـەکی وردی دورو درێـژ لـە کیشـوەری ئەمەریکادا، رووداوی سەیری دۆزیەوە.لەبارەیەوە ناوبراو نووسی : ((لێرە، لە دەوروبەری (١٠٤٠٠) ساڵ پێش ئێستا لەپڕ شوێنەواری مرۆڤ نامێنی.... هەموو ئەو زانیاریانەی هەتا ئێستا دەستمان کەوتوون ئەوە ئەگەیەنێ کە لەو دەوروبەرەدا بەهۆی رووداوێکەوە مرۆڤی تێدا نەماوە)). ئەم رووداوە روون کردنەوەی ئاسان نیە. ئەگەر ئەوە بخەینە پێش چاومان کە لە کاتی دواجاری سەدەی بەستەڵەک دا زۆربەی رووبەری کیشوەری ئەمەریکا بە بەفر دانەپۆشرابوو، (وێنە – ٥ -). کۆنترین شوێنەواری ژیانی مرۆڤ لەسەر نیمچە دورگەی ئەسکەندیناڤی و ئینگلتەرەش ئەگەڕێتەوە دەوروبەری پێش (١٠٤٠٠) ساڵ. ئەمە لە خوارووی ئەورووپادا نابینرێ. بۆ وێنە، ئەو وێنانە لە ئەشکەوتە بەناوبانگەکەی ((لاسکۆ)) ی ناوەراستی فەرەنسادا دۆزراوەتەوە – کە یەکێکە لە هەرە بەنرخترین کۆگای شوێنەواری ژیانی کۆنی جیهانی – ئەگەڕێتەوە بۆ زۆر لەمە دوورتر، بۆ (١٥٠٠٠) ساڵ لەمەوپێش.

سەرسوڕهێنەر ئەوەیە کە ئەم ((پچڕاند))ی ((ژیان))ە لە زۆربەی شوێنی جیهان دا ئەبینرێ. لە ئەمەریکا و ئەورووپا و ناوەراستی ئاسیاشدا بەرچاو ئەکەوێ. بۆ وێنە، ئەشکەوتە بەناوبانگەکەی ((شانەدەری)) لە شاخەکانی کوردستاندا[3] وەک ئارشیڤێکی نایابی

---

٣ - ئەم زاراوەیە هی نووسەر خۆیەتی . وەرگێڕ

پاراستنی شـوێنەواری شارسـتانی و مێـژووی مرۆڤایـەتی یـە بـە درێژایـی (١٠٠٠٠٠) سـاڵ. پشـکنین و لێکۆڵینـەوەی هـەر چینێـک لـە چینـەکانی نـاخی ئەشـکەوتەکە شارسـتانیەتێک و مێژوویـەکی جیـاواز دەرئەخـەن هـەتا ئەگاتـە هـەمان مێـژووی (١٠٠٠٠) سـاڵ پـێ.ز. و ئەوساش لەپڕ شوێنەوار نامێنێ... نیشانەی بوونی مرۆڤ ئەکوژێتەوە و وەک لەپڕ ئەشکەوتەکە و دەور و پشتی مرۆڤی تێدا نەمابێ وایە ! لـەوە ئـەچێ ئەمـە هـەرواش بـووبێ. لـەباتی شـوێنەواری ژیـانی مرۆڤایـەتی شـوێنەوارێکی تـر دروسـت بـوە کـە ئـەویش پاشماوەی خڵتـەی ئـاو، کەرەسـتەی بـە ئـاو شـۆراوەیە کـە ئـەوە ئەسـەلمێنێ ئەشکەوتەکە، کە (٧٥٠) مەتر لە رووی زەریاوە بەرزە، بووبێ بەژێر ئاوەوە. هـەروەها شـوێنەواری کەوتنـە خـوارەوەی بـەردی بن میچـی ئەشـکەوتەکەش بـەدی دەکرێ کـە نیشـانەی روودانـی بوومەلـەرزەی زۆر بـەهێزە کـە ئـەو نـاوەی شـڵەقاندووە. تـەنها پـاش رابوردنی پێنج هەزار ساڵ بەسـەر ئەمـەدا سـەرلە نوێ نیشـانەی پەیدا بـوونی ژیـان لـەم ئەشـکەوتەدا پەیدا ئەبێتـەوە، لەسـەرەتاوە زۆر کـەم و لـەوە پـاش بەشێوەیەکی ئاسایی.

* * * *

وەک ئەبینین، لەکاتی روودانـی کارەسـاتەکەدا تەقینـەوەی بورکـانی بـە هێزیشـی بـەدوادا هـاتوە. لەسـەرەوە باسـی ئـەو پارچـە بورکـانی یـەمان کـرد کـە نموونـەیان لـە نـاخی ئۆقیانووسـی ئەتڵەسـی دا دەرهێنراوە. لەم دواییەش دا لە قووڵایی پتر لە کیلۆمـەتر و نیوێک لـە ژێـر سـەهۆڵی ((ئەنتراکتیـد)) دا شـوێنەواری خۆڵەمێشـی بورکـانی دۆزراوەتـەوە. ئێسـتا زانایـان خـەریکی ئـەوەن بیسـەلمێنن ئایا ئـەم

کەرەستە بورکانیانە لە شوێنێکی ترەوە گەیشتوونەتە ئێرە یان لە ئەنجامی تەقینەوەی بورکانی ئەم ناوچانەدا پەیدا بوون. بەلام لێرەش دا مێژووی پەیدا بوونی ئەم کەرەستە بورکانیانە گرنگ و سەرسوڕ هێنەرە کە ئەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی (٨ – ١٢) ی پی.ز.!

بەم جۆرە، ئەو زانیاریانەی لە زۆربەی کەل و قوژبنی جیهان دا کۆ کراونەتەوە لە دەوری هەمان مێژوو ئەسووڕێنەوە.

ئەتوانین بە شی کردنەوەی ئەو زانیاریانە وردتر کاتی ڕوودانی ((کارەساتەکە)) دیاری بکەین.

((ڤ. گ. کوکلین)) ی زانای ((نۆڤەسیبیرسک)) ی لەو کاتەدا کە خەریکی لێکۆڵینەوە بوو لە چۆنیەتی پێشخستنی زانیاری کۆکردنەوەی هەواڵی ((فێرکردن)) چەند شێوەیەکی کۆکردنەوەی ((سروشتی)) گردبوونەوەی هەواڵ تووش هات. ئەوەش بریتی بوو لەوەی کە شێوەی تێکەلاو و ئالۆزی ((خۆفێر کردن)) لەوکاتەدا کە هەوڵ ئەدات بگاتە رادەیەکی تێکڕایی بەرنامەی دەرخستن و ئاشکراکردنی ئەو زانیاریانەی کۆکراونەتەوە، ئەو بەرنامانە لەسەر بنچینەیەکی ((هەڕەمەکی)) دروست نابێ بەڵکو بە شێوەیەکی ڕێک و پێکی دیاری کراوی گردبوونەوەی هەواڵ بەرز ئەبنەوە و نزم ئەبنەوە.

بەرزبوونەوەکەی لەو کاتەدا ئەبێ کە ئەو زانیاریانەی لە چوارچێوەی بەرنامەکان دا کۆکراونەتەوە بە خێرایی و چالاکی ئەکەونە کار، و نزم بوونەوەکە لەوکاتەدا ئەبێ کە بەرنامە کۆنەکە لەناو ئەچێ و ((خۆی ئەخوات)) و بەرنامەیەکی تازە دەست پێ ئەکات کە لەوەی پێش خۆی تێکڕایی تر و هەمەچەشن ترە. ئەگەر

وای دابنێ ین کە ئەم شێوەیە بۆ هەموو کارێکی ((خۆ رێکخەر)) ئەگونجێ و

لەو زانیاری یە دیموگرافیانە[٤] ورد ببینەوە کەلەم دوو هەزار ساڵەی دواییەدا کۆبوونەتەوە و لەبەر رۆشنایی ئەوە هێڵی ((بەیانی)) دیمۆگرافی بەرەو ((رابردوو)) بکێشین ئەگەینە ئەنجامێک کە زۆر نزیکە لەو ئەنجامەی زانایانی دیمۆگرافی بۆیان دەرخستووین، ئەوەی شایانی باسە بە پێ ی ئەو هێڵە بەیانی یە ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی لە پێ.ز. دا ئەگاتە نزیکەی (٢٥٠) ملیۆن کەس، بەڕای زانایانی دیمۆگرافیش لە نێوان (١٥٠ – ٢٠٠) ملیۆن کەس دایە!).

ئەگەر زیاتر لەسەری بڕۆین و پتر بەرەو رابردوو بکشێ ین ئەبینین ئەو هێڵە بەیانی یە بەرەبەرە نزم ئەبێتەوە هەتا ئەگاتە نزیکی (٨) ملیۆن کەس لە ساڵانی (٨٨٠٠ – ٨٦٠٠) پێ.ز. دا، لە دوای ئەمە بۆ چەند سەدەیەک ئەم ژمارەیە بە نەگۆڕاوی ئەمێنێتەوەو پاش ئەمە هێڵەکە دەست ئەکاتەوە بە بەرزبوونەوە و لە نێوان ساڵانی (١١٨٠٠ – ١١٦٠٠)ی پێ.ز. دا ئەگاتە لوتکەی بەرزی کە نزیکەی (٥٠٠) ملیۆن کەسە. (وێنە – ٦ –).

ئەگەر ئێستا بەو پێ یەی کە بەراستی رووی داوە سەیری ئەم هێڵە بەیانی یە بکەین – واتا لە رابوردووەوە بۆ ئێستا نەک لە ئێستاوە بۆ رابوردوو – بۆمان دەرئەکەوێ کە ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی هەتا کاتی ((نزم بوونەوەکە)) هەر روو لەزیاد بوون بوە

---

٤ – دیموگرافیا : وشەیەکی یونانی یە : demos گەل + grapho ئەنووسم : ئەو زانیاری یەی لە ژمارە و گواستنەوە و دروست بوونی گەلان ئەکۆڵێتەوە . وەرگێر

و ((لەپڕ)) لەنێوان ساڵانی (١١٨٠٠ – ١١٦٠٠) پ.ز. بە رادەیەکی زۆر کەم بۆتەوە وئەم کەم بوونەوەیەش نزیکی دوو سەدەی خایاندوە. پاش ئەمە کەم بوونەوەی ژمارەی دانیشتوان لەسەرخۆترە و نزیکە لە نەگۆڕانەوە و پاش ساڵانی (٨٨٠٠ – ٨٦٠٠) پێش. ز. دەست ئەکاتەوە بە زیادبوون – ئەو زیاد بوونەی هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە.

گرنگ و سەرسوڕهێنەر ئەوەیە، ئەو بەڵگانەی بە هۆی زانیاری جیاجیا و دوور لە یەکترەوە کۆکراونەتەوە هەمان مێژوومان بۆ دەرئەخەن : بۆ وێنە، سەرەتای رۆژ ژمێری ((مانگی و رۆژی)) هیندی لە ساڵی (١١٦٥٢. پ.ز)ەوە دەست پێ ئەکات. رۆژ ژمێری ((مای)) لە چەند ((کۆمەڵە ساڵێک)) پێک هاتوە کە هەر یەکێکیان بریتیە لە (٢٧٦٠) ساڵ. کە کۆتایی یەکێک لەو کۆمەڵانەمان زانی و بەو پێ یە بەرەو رابووردوو رۆیشتینەوە ئەگەینەوە مێژووی (١١٦٥٣ ساڵ پ.ز) !

پاش کارەساتە جیهانی یەکە ماوەی دووسەد ساڵێک ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی هەر لە کەم بوونەوەدا بووە. لەو ماوەیەدا ئاوەکە گەڕاوەتەوە شوێنی خۆی و تەقینەوەی بورکان و بوومەلەرزە کەم بۆتەوە و بەرەبەرە تیشکی رۆژ ئەو پەردە ئەستوورە غازانەی بڕیوە کە بە دەوری ئاتمەسفێری زەوی دا دروست بووبوو. بەرای ((هـ بێلامی)) ئەمە کۆتایی ماوەی کارەساتەکەیە و بوە بە سەرەتای ساڵی پەیدا بوونی دوو جۆر رۆژ ژمێری تر – رۆژ ژمێری ئاشووری و رۆژ ژمێری میسری کۆن.

رۆژ ژمێری میسری کۆن کەلەسەر بنچینەی ((رۆژ)) دروست کراوە لە چەند کۆمەڵەیەکی (١٤٤٠) ساڵی پێکهاتوە. کۆتایی یەکێک

لەو کۆمەڵانەمان لا ئاشکرایە کە ساڵی (١٣٢٢ پی.ز.)ە، ئەگەر بەم پێ یە کۆمەڵ کۆمەڵ بڕۆین بەرەو دواوە ئەگەینە سەرەتای دروست بوونی رۆژ ژمێرەکە کە ئەویش ساڵی (١١٥٤٢ پێش. ز)ە!

رۆژ ژمێری ئاشووری لەسەر بنچینەی ((سووڕانی مانگ)) دروست کراوە و ئەو کۆمەڵە ساڵانەی لێ یان پێک هاتوە زۆر لە کۆمەڵەکانی رۆژ ژمێرە میسریەکە جیاوازە و هەر کۆمەڵەیەکی بریتیە لە (١٨٠٥) سال، هەروەها کۆتایی یەکێک لەو کۆمەڵە سالانەش زۆر دوورە لە کۆتایی کۆمەڵە ساڵەکانی رۆژ ژمێرە میسریەکە و بریتیە لەساڵی (٧١٢ پی.ز.) لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر کۆمەڵ کۆمەڵ بیخەینە سەر یەک و بەرەو دواوە بگەڕێ ینەوە بە شێوەیەکی ئێجگار سەرسووڕهێنەر ئەگەینەوە هەمان سەرەتای دەست پێ کردنی رۆژ ژمێرەکە کە ئەویش بریتیە لە ساڵی (١١٥٤٢ پی.ز.!).

هیچ رێ‌ی تێ ناچێ و ناشێ ئەم دوو ژمارەیە بەرێکەوت وەک یەک بن. زیاتر ئەوە رێ ی تێ ئەچێ کە سەرەتای دروست کردنی هەردوو رۆژ ژمێرەکە یەک رووداوبێ. بەرای ئێمە ئەو رووداوەش پەیوەندی هەیە بە کارەساتی لافاوە جیهانی یەکەوە !

بەم جۆرە ئەتوانین ئەم دوو مێژووەی باسمان کردن، وتا ساڵانی ١١٦٥٠ (یان ١١٦٥٢ یان ١١٦٥٣) پی.ز. و ١١٥٤٣ پی.ز. دابنێ ین بە سەرەتاو کۆتایی هاتنی ماوەی ((کارەساتەکە)) !!

## شەڕی مار و باڵندە

لە زۆربەی سەرچاوە ئاینی و ((جادووگەری)) یەکان دا رووداوە گرنگەکان بە ((رەمز)) نیشان دراون. واتای ئەم رەمزانەش ژمارەیەکی زۆر کەم لە پیاوانی ئاینی زانیویانە. هەر بە هەمان شێوەش باسی ئەم کارەساتە کراوە کە ئێمە مەبەستمانە. لەم روەوە ئەوە بەسە بڵێ ین کە بیر و رای هەندێک لە زانایانی ئاینی عیسایی، تێهەڵکێشانی منداڵی کۆرپە لە ((ئاوی پیرۆز)) دووبارە کردنەوەی یادی لافاوەکەیە کە کاتی خۆی مرۆڤایەتی لەناو بردوە !

بە شێوەی جیاوازی لەمە ئاڵۆزتر باسی ئەم کارەساتە لە ئەفسانە و سەرچاوە ئاینی یەکانی گەلانی تردا بەرچاو ئەکەوێ. ئەفسانەی ئاینی زۆربەی گەلانی سەرزەوی دەری ئەخات کە لە کۆن دا، پێش پەیدا بوونی وشکانی، هەموو سەر زەوی بە ئاو داپۆشراوە کە ((گیان لەبەرێکی سەرەتایی)) نزیک لە شێوەی ((مار)) ی تێدا ژیاوە. بە پێ ی ئەفسانەکان ئەو مارانە (یان ئەژدیهایانە)، کە لەوە پاش بوونەتە رەمز و نیشانەی ئۆقیانووس بەتایبەتی و ئاو بە تێکرایی، پێش پەیدابوونی ژیان لەسەر زەوی وشکانی لە ((ژیانی سەرەتایی)) ئاسمان دا جێ ی خۆیان کردۆتەوە. هەر ئەویش، واتا مار، بوە بە نیشانەی گەڕانەوە بۆ سەرەتای یەکەمی زیندوویەتی، واتا نیشانەی لەناوچوونی ژیان و پەیدا بوونی کارەساتی لافاوەکە. یەکێک لە نوسراوە بابلی یەکان ئەو ساڵەی لافاوەکەی تیا رووداوە بە ساڵی ((نەڕاندنی ئەژدیها)) ناو ئەبات.

لـە ئەفسـانەی کـۆنی هیندیشـدا مـاری ((جیهـانی بـێ بـن)) دژی پەیـدابوونی سـەرەتای ژیـانی ژیریـی لەسـەر زەوی ئەجـەنگێ، ئـەو ئەیەوێ جیهان بگەڕێنێتەوە بۆ سـەرەتای یەکەمی زیندوویەتی، (واتا ژیـانی نـاو ئـاوی پـێش پەیـدابوونی وشکانی). ئەفسـانەکە ئـەڵێ : ((جارێـک ئـەو مـارە، کـە لـە ((ئـاوە جیهـانی یەکـەدا)) ئـەژیا زەوی ((رفانـد)) و لـە گـەڵ خـۆی دا بردیـە نـاخی ئۆقیانووسـەوە، بـەلام خواوەنـد ((نیشـتو)) کەوتـە جەنگـەوە لـە گـەڵ مارەکـەدا و زەوی لەدەسـت رزگـار کـرد و دووبـارە سـەری خسـتەوە بـۆ سـەر رووی ئاو.))

زۆر رێ ی تێ ئەچێ لەم ئەفسانەیەدا ((رفاندن)) ی زەوی بۆناو ئـاوی ئۆقیـانووس مەبەسـت لـە داپۆشـینی وشـکانی یـەکی گـەورە و بـەرین بێ لـەکاتی کارەسـاتی لافاوەکـەدا. وەک ئـەبینین لێرەشـدا مـار نیشانەی بەلا و سەرگەردانی و لەناوبردنی پەیدابوونی ژیانی ئاسـایی یە لەسـەر زەوی و دوژمنایـەتی لەگەڵ خـوای ((خـۆر)) دا ئـەکات ! لـە میسری کۆنیشـدا نیشـانەی تێکدانی ئـارامی جیهـانی مـارە، یـان مـاری ئاسـمانی – (وێنـە – ٧ –) کـە هەنـدێ جـار لـە شـێوەی مـاری ((ئەپۆپیس)) دا دەرئەکەوێ و هێزێکی رەشی بێ سنووری

لـەناوبردنی هەیـە و هەنـدێک جـار لەشـێوەی مـاری خـوای ئـاودا دەرئەکەوێ کە هێزی هەستانی

لافاوی پێ سپێرراوە و هەندێ جاریش لەشێوەی ماری خـوای ((سێتخ)) دا خۆی ئەنوێنێ

کــە هێزێکــی بــێ ســنووری رووداو و کارەســاتی سروشــتی لەئەستۆدایە.

لەزۆر نوسراوی میسری کۆن دا ماری ((ئەپۆپیس)) بە ((لەعنەت)) کراوە. بۆ وێنە، لە ((کتێبی مردوان)) دا بەمار ئەوترێ : ((بۆ دواوە ئەی بەد فەسـاڵ، بگەڕێرەوە نـاخی ((بـێ بـن)) ی، بـۆ ئـەو جێگایـەی باوکت فەرمانی پێ دابووی تیایدا بمێنەوە و لێ ی بمریت... لـەم جێگا پیـرۆزە نزیـک مەبـەرەوە کـە ((رەع)) ی تێدایـە..)) لێرەشـدا هـەر مـار نیشـانەی ئـاو، بـێ ئـارامی و دوژمنـی ((رەع)) ی خـوای رۆژە کـە خاوەنی هێزی نەهێشتنی ئاژاوە و پەیدا کردنی هێمنی‌یە.

بـەواتای ئەفسـانە کۆنـە میسـری یـەکان هـەموو رۆژێـک لـەکاتی هـەڵهاتن و ئـاوابوونی رۆژدا مـاری ((ئـەپۆپیس)) هـەوڵ ئـەدات ئـەو بەلەمە نوقوم بکات کە خوای رۆژ تیایدا هات و چۆ ئەکات. هەروەها هـەرجارێک لـە میسـری کـۆن دا رۆژ بـەناو هـەورێکی رەش دا تێپـەڕ بوایـە و دەربکەوتایـەوە ئـەیان ووت : ((وا خـوای رۆژ بەسـەر مـاری ((ئەپۆپیس)) دا سەرکەوت.)) لە حەوزە پیرۆزەکەی ((هیلیپەپۆل)) یش دا وێنـەی ماریـان بـە لەعنـەت ئـەکرد بـەنیازی ئـەوەی هێـزی رونـاکی بەسەر هێزی تاریکی دا زاڵ ببێ.

ئەفسانەی کۆنی جوولەکەش دەربارەی مـاری ((ناکهـاش)) ئـەدوێ کە لە زەریای سەرەتای زیندوویەتی دا ژیاوە. ئـەو مـارە دوژمنایـەتی لەگـەڵ ((یاخڤـا)) ی خـوای ((سـەروو)) ئـەکرد و ئەیویسـت یاسـای

سروشـت تێـک بـدات و جـێ ی مانـگ و ئەسـتێرەکان بگـۆڕێ. لـە ئەفسانەی کۆنی ((بابلی)) شدا ماری [٥]

((تیماتـا)) لەگـەڵ ((مـەردوخ)) ی خـوای رۆژدا ئەجـەنگێ. لـە ئەفسانەی کۆنی ئەندەنوسیا

و چینـیش دا مـاری ((کـوون کـوون)) نیشـانەی لافـاوە. لـە ئەمەریکاش دا ((تلاڵۆک)) ی

خـوای ئـاو، کـە هێـزی پەیـدا کردنـی لافـاوی لـە ئەسـتۆدایە، هەرلەشێوەی مار دا دەرئەخرا

(وێنە ٨).

لە هەندێک شوێنی تردا هەمان خوا لەشێوەی مارێکی شاخدار یان ((مـارە مەزنەکـە))ی ((ئـەکۆمێناکی)) دا دەرئەکـەوێ کـە هـەمان ئیشـی نـەگۆڕاوی پـێ سـپێرراوە کـە ئـەویش لافـاوە ! هەنـدێک لـە زانایـان باوەڕیان وایە کە ئەم نیشـانەیە لەنـەژادا لـە ئەمـەریکادا نـەبوە. چونکە شـێوەی مـاری زۆر ناوچـەی سـەر زەوی لـە ئەمـەریکادا هەیـە. وەک میسـری و بـابلی و ئەندەنوسـی و چینـی و یابـانی. لەئەنجامـدا لەبـەر رۆشنایی ئەم هـەموو شـێوانەدا پیاوانی ئـاینی ئەمـەریکای ناوەراسـت شێوەی ماری ئەمەریکی یان هێنایە گۆڕێ کە لە راسـتی دا لەشـێوەی بەشەکانی ماری ئەو وڵاتانە وەرگیراوە کە باسمان کردن !

---

٥ – لە ئەفسانە و چیرۆکی کۆنی کوردی شدا مار و ئەژدیها هەمیشە بە هێزی خراپە و دوژمنـی چاکـە نیشـان دراوە و مـارێکی درێـژ بازنەیـەکی بـەدەوری ئاسـمان دا دروسـت کردوە کە کلک و سەری داویەتیەوە لەیەک . وەرگێڕ

((خـۆر)) زۆرجـار لەشـێوەی باڵنـدەدا دەرئـەخرێ، بۆیـە هـەراو خەباتی نێوان ئەو دوو سەرەتایەی باسمان کردن لەشێوەی خەباتی مـار و باڵندەدا دەرئەکەوێ. ئـاینی عیسـایی ئـەم شـێوە خەباتـەی لـە رۆژهەلاتی نزیکەوە وەرگرتوە و لە وێنەی ناو کڵێسـەکانی سـەدەکانی ناوەراست دا ئەمـە بـە ئاشـکرا ئـەبینرێ. (وێنـە – ١٠ -) لـە هیندسـتان باڵندەی پیرۆزی ((هاروودی)) لەگەڵ ((ناگا)) ی ماری ئاودا ئەجـەنگێ.

لە ئەفسانەی کۆنی یابانی دا باڵندەی

((پیرۆزی پێنگۆ)) ئەبینین کە مـارێکی بـە دەنووک هـەڵگرتوە. ئـەم نیشـانەی خـەباتی نێـوان باڵنـدە و مـارە تـەنها لـە ((دنیـای کـۆن)) دا نەمایەوە و بە ئۆقیانووس دا گەیشتە ئەمەریکا (وێنـە – ١١ -) ئێسـتا وێنـەی لـەم چەشـنە هـەتا لەسـەر بەیـداخی دەوڵـەتی مەکسـیکاش کێشراوە (وێنە – ١٢ -).

هەندێک جار لەباتی نیشانەی باڵندە و رۆژ ((دەوری)) یـەکی خڕی باڵدار دەرئەکەوێ. ئەمەش لەوە ئەچێ کە لـەم نیشـانانە پێک هـاتبێ : ((خڕی)) کـە نیشـانەی رۆژە و بـاڵ کـە نیشـانەی باڵندەیـە. بەم جۆرە ((گۆر)) ی خوای میسری کە چوە شـێوەی هـەڵۆوە لـە وێنـەی دەوری یەکی خڕدا هێرش ئەباتـە سـەر ((سـێتخ)). هێرشـەکەش بـەوە کۆتـایی دێت کە ((سێتخ)) ئەچێتە شێوەی مارێکی

هاوارکەرەوە و لە کونێکی زەوی دا خۆی ئەشارێتەوە.

لە ئەفسانە بابلی یەکانیش دا ((بێڵ)) ی خوای

((سەروو)) لەشێوەی دەوری یەکی باڵدار لەگەڵ

ماردا شەڕ ئەکات کە دووبارە نیشانەی ئاوە.

لە هیندستان ((ڤیشنۆ)) لەشێوەی دەوری یەکی باڵدار
دەرئەکەوێت و بەسەر ماری نیشانەی لافاودا زاڵ ئەبێ.
نیشانەی ((دەوری باڵدار)) لە پۆلۆنیزیا و میسر و لای
((خیتی)) یەکان و خواروی ئەمەریکا و لای ((مای))
و ئاشووړری یەکانیش بەدی ئەکرێ. (وێنە – ٩)

لە هەمووشیان دا هەریەکە واتا ئەبەخشێ : زاڵ بوونی هێزی چاکە و ئارام و هێمنی بەسەر هێزی لەناوبەری ((ئاو)) دا !

بەم جۆرە، ئەو کارەساتە ئاسمانی یەی کە لە کۆن دا رووی داوە و بەلای بەسەر زەوی یەکەمان دا هێناوە لە ئەفسانەی زۆربەی گەلان دا لەشێوەی خەباتی نێوان مار و باڵندە و مار و دەوری باڵداردا نیشان دراوە.

## مرۆڤی ((ژیر)) لەسەر زەوی

**((هیپۆتێزی زانیاری هەمیشە لە چوارچێوەی
ئەو راستیانە دەرئەچێ کە ئەبنە بنچینە
بۆ سەلماندنی))**

((ڤ. ی. ڤێرنادسکی))

هەرچەنــدە زۆر زانیــاری و دەستنووســی کــۆن لەبەردەســت مێژوونووســان دا کۆبۆتــەوە لەگــەڵ ئەوەشــدا زۆرکــەم دەربــارەی کۆنترین مێژووی مرۆڤایەتی ئەزانین. هۆی سەرەکی ئەمەش ئەوەیە کە ناتوانین هەمیشە لەژێر پەردەی ئەو زانیاریانەی لە ئەفسانەکان دا هەن رووی راستەقینەی مێژوو ببینین. بۆ وێنە، ئەگەر مرۆڤ لە نوسراوێکی کۆن دا ئەمە بخوێنێتەوە : ((لە فلانە ساڵ دا ئەژدیهایەکی ئاگرین بە ئاسمان دا تێپەڕی.)) ئەتوانێ بە سێ شێوە ئەم رووداوە لێک بداتەوە :

١ – ئەمــە کارەســاتێکی راســتەقینەیە و بــەوجۆرە رووی داوە کەباس کراوە. (بێ گومان ئەمەش بیرێکی منداڵانەیە و تەنها بۆ منداڵ باشە).

٢ – لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی ئەو باسە هەمووی خەیاڵە (کە ئەمەیان لە هەموو شتێکی تر ئاسانترە، لەبەر ئەوە لە هەموویان بێ هێزترە.)

٣ – بیرلەوە بکاتەوە کە لەژێر پەردەی ئەفسانە و ئاینەوە بڕوانێتە ئەو رووداوە راستەقینەیەی کە بۆتە هۆی پەیدا بوونی ئەو

ئەفسانەیە، وەک دەرکەوتنی ((کەمیتا)) و ((بۆلید)) [1] و هتد... واتا بەشێوەیەکی زانیاری ڕاست ئەو ئەفسانەیە شی بکرێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە ئەتوانین ئەم نموونەیەی خوارەوە بهێنینەوە.

لای هەموان ئاشکرایە کە ک. مارکس و ف. ئەنگلس چەند دژی بیر و باوەڕی ئاین وەستاون دەربارەی پەیدا بوونی گەردوون و ڕەخنەی توندیان لێ گرتوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هەڵوێستەیان ڕێ ی لێ نەگرتوون ئینجیل بەسەرچاوەیەکی مێژووی بزانن، بۆیە لە شی کردنەوەی ((خەوەکەی یۆحونای پیرۆز)) دا کە یەکێکە لەهەرە تاریکترین بەشەکانی ئینجیل ف. ئەنگلس ئەڵێ : ((ئەم بەشە بەجۆرێکی وا ژیانی سەدەی عیسایی سەردەمی ساڵی (٦٨٠) پا.ز. — ی تێدا روون و ئاشکرایە ئەڵێ ی ((لە ئاوێنەدا ئەیبینی)) [2] هەمان شت دەربارەی نیشانەی ((رەمزی)) و جادووگەری و ژمارە و هتد.

وتراوە، وەک : ((بینیم چۆن ئەگنێتس مۆری یەکەمی حەوت


( وێنە -١- )

مۆرەکەی هەڵپچڕی و گوێم لەدەنگی یەکێک لەو چوار حەیوانە بوو کە بەدەنگێکی بەرز ئەینەڕاند و ئەیوت : وەرە سەیرکە.)) ف. ئەنگلس بەسەرسوڕمانەوە باسی ڕاستی و ((مەعقولیەت)) ی ژمارە سیحراوی یەکانی ئینجیل ئەکات، وەک ((حەوت دڕندە)) و ژمارە (٦٦٦) و هتد.

---

١ - بۆلید : Bolidos : وشەیەکی یۆنانی یە : ئەو ئەستێرە زۆر بەشەوقانەی کە لەشێوەی پارچە میتیۆردا ئەکەونە خوارەوە . وەرگێڕ

٢ - ک . مارکس و ف . ئەنگلس : دەربارەی ئاین . موسکۆ ١٩٥٥ ، ل . ( ١٦٠ ) .

نابێ ئەوەمان لەیاد بچێ کە ئەفسانە و نوسراوە ((پیرۆزەکان)) ئاوێنەیەکی روونی کۆمەڵایەتی ئەو کاتەن و بە پێ ی رادەی بیرکردنەوە و تێگەیشتنی مرۆڤی ئەوسا رووداویان تۆمار کردوە، بۆیە ئەتوانین دەربارەیان ئەم قسانەی لینین بڵێ ینەوە : ((هەستی کۆمەڵایەتی قەبارە و بوونی کۆمەڵایەتی روون ئەکاتەوە)) [٣] . کەواتە پێویستی سەرشانی زانایان ئەوەیە هەواڵی رابردووی کۆن بهێننە ناو چوارچێوەی روون کردنەوەی نوێ وە و وای لێ بکەن لەگەڵ تێگەیشتنی نەوەی ئێستادا بگونجێ. بەڵام دیارە بۆ ئەمە پێویستە لە پێشدا بەوردی بیان خوێنینەوە و تێ یان بگەین، بێ گومان ئەمەش ئاسان نیە. بۆ سەلماندنی ئەمە ئەم نموونەیە ئەهێنینەوە :



بۆ دەرخستنی نەهێنی نوسراو، و ئەلف و بێ ی ((کریت)) زانایان تەنها واتای وشەیەکی هەژدە نیشانەییان زانیوە بێ ئەوەی بزانن دەنگی هەریەکێک لەم نیشانانە چۆنە، لە کاتێکدا کە بەبێ ئەمە هیچ نایەتە ئەنجام و ئەوە روون نابێتەوە ئایا ئەو زمانەی ئەو گەلە بلیمەت و خاوەن شارستانیەتە بەرزە پێ ی دواوە لەکام گروپی زمانە، بۆیە بۆ ئەوەی بەتەواوی ئەو دەنگانە بزانرێ زانایان پێویست

---

٣ – ڤ . ا . لینین : نوسراوەکانی ، بەرگی ( ١٨ ) ل . ( ٣٤٣ ) .

بوو هەر یەکێک لەو هەژدە نیشانانە دەنگی جیاجیای پێویستی هەموو پیتەکان دابنێن، بۆ ئەمەش نزیکەی (٢٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) شێوەی جیاجیای ئەم وشەیەیان دەست ئەکەوت کە لەمانەش تەنها هەر یەکێکیان راست ئەبوو ! بەم جۆرە ئەگەر زانایان لەسەر ئەم شێوە



برۆشتنایە بۆ خوێندنەوەی ئەو دەستنووسانەی لەم دواییەدا لە قەراغ ((زەریای مردو)) دۆزراونەتەوە وا چەندسەد ساڵێکیان ئەویست، چونکە ئەبوایە بۆ هەر دەنگێک و واتایەک و کارێکی زمانەوانی کۆمەڵە دەنگ و پیتێکی بێ سنوور دابنرێ و جێ گۆڕکەیان پێ بکرێ و هەموو دەنگێک و واتایەکی لەگەڵ ئەوەی پێشوودا بەیەکەوە ببەسترێتەوە و وەک کوێر دەست بکوترێ بۆ دۆزینەوەی ئەو ((دڵۆپە)) دەنگە پێویستەی لە زەریایەکی فراوانی دەنگی نەناسراودا ون بوە، ئەمەش بێ گومان نە لەهێزی تاکە کەسێک و نە لەهێزی کۆمەڵێکی گەورەی زانایان دا نیە. ئێستا بۆ یارمەتی زانایان ئەلەکترۆن هاتۆتە پێشەوە.

لەبەر ئەوەی دەستنووسەکانی ناوچەی ((زەریای مردوو)) پەیوەندی یەکی نزیکی هەیە بە بنەڕەتی مێژووی ئاینی عیسابییەوە،

فاتیکان گرنگیەکی زۆری دا بە شی کردنەوە و خوێندنەوەیان. بۆ ئەمەش زانایان ئامرازێکی ئەلەکترۆنی ((بیرتیژ)) ی وایان دروست کرد کە ژمارەیەکی بێ سنوور زانیاری زمانەوانی و مێژوویی و شوێنەوار زانی یان تێدا کۆکردەوە، بۆ وێنە، هەموو وشە و دێڕێکی ئینجیلی ((لەبەربوو)) و ئەیزانی بەچەند جۆر و شێوە ئەخوێندرێتەوە. یەکێک لەو نوسراوانەیان دایە کە ئەیان ویست ((مەتەڵ)) ەکەی ((هەڵهێنن)) و زانایان بە هەناسە لێ براوی یەوە چاوەڕێ ی ((بڕیار)) ە کەیان کرد... وا مەکینەکە هاتە قسە !. ئەو وشانەی نەناسراوە کۆنەکان نەخشیان کێشابوو وا پاش دووهەزار ساڵ هاتنەوە قسە و ((دەنگ)) یان ئاشکرا بووەوە ! ئامرازەکە بەم جۆرە تەرجومەی نوسراوەکەی کرد : ((ئا لەم بیابانەدا ئەگەڕێ ین بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕێگایەی بەرەو لای خوامان ئەبات.)) !



پاش خوێندنەوەی نوسراوەکە ئەوسا بەشی سێهەمی ئەم کارە دەست پێ ئەکات کە گرنگترینیانە و بریتیە لە شی کردنەوە و لێکۆڵینەوەی نوسراوەکان.

ئێمە بەکورتی ئەم باسەمان گێڕایەوە، تونها بۆ ئەوەی کە بزانرێ سەرچاوەی کۆن چەند کەمە و ئەوەی هەیە چەند بەگرانی و ئاڵۆزاوی ئەخوێندرێتەوە و لەبەر وئەمەشە کە زانیاریمان دەربارەی مێژووی هەرە کۆنی مرۆڤایەتی زۆر کەمە.

هەرچەندە کاروباری ئارکیۆلۆجیا زۆر بەربڵاوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی ئێجگار کەم و هەست نەکراوی رابردوومان لێ ئاشکرایە. بۆ وێنە، ئەوە چەند نەوەی زانایان خەریکی لێکۆڵینەوە و دۆزینەوەی شوێنەواری سۆمەری یەکانن، لەگەڵ ئەوەش دا هەتا ئێستا تەنها نزیکەی ١% ی شارەکانیان دۆزیوەتەوە و ٩٩% ی ئەو شارانە هێشتا هەزارەها ساڵە لەژێر خاک دا شاردراونەتەوە. ئاخۆ ئەگەر ئەم شارانە هەموو بدۆزینەوە چەند نەهێنی ئاشکرا ئەبێ و چەند مەتەڵی نوێ دووبارە بەرەنگاری زانایان ئەبێتەوە ؟ !

بەهۆی کۆشش و هەرەوەزی زانایان و دروست کردنی زنجیرەی نەپچڕاوی یەکێتی زانیاری یەوە ئەو شوێنەوارانەی ئەیدۆزنەوە لەناخی تاریکی و لەبیر چوونەوەوە رووداوی داپۆشراو و زانیاری ون بوو، و گەلان و دەوڵەتی لەبیر چوەوە ئەهێننەوە بەر تیشکی روون کردنەوە.

بۆیە ئەبینین لەسەرەتای سەدەی بیستهەم دا زانایان تەمەنی پەیدا بوونی مرۆڤیان لە ئەمەریکا بە (٤٠٠٠) ساڵ پێش ئێستا دائەنا، دوایی کردیان بە (١٠٠٠٠) ساڵ و (٢٥٠٠٠) ساڵ و لە دواییدا کردیان بە (٤٠٠٠٠) ساڵ. لەمەش پتر، زانای ئارکیۆلۆجی بەناوبانگی ئەمەریکی ((کارتەر)) ئەم تەمەنە ئەگەیەنێتە (١٠٠٠٠٠) ساڵ.

درێژکردنەوەی تەمەنی پەیدا بوونی رووداوی مێژوویی و هەوڵ دان بۆ گەیاندنیان بەکاتی دورتر و کۆنتر شارستانیەتی جیاجیاش ئەگرێتەوە.

بە پێ ی ئەو بیر ورایەی لە هەموو راکانی تر ئێستا چەسپاوترە پەیدابوونی یەکەم شارستانیەت لە ناوەراستی ئەمەریکادا ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەکانی پاش. ز. بەڵام ئەم زانیاریانەی لەم دواییەدا کۆ بوونەتەوە ئەوە ئەسەلمێنن کە زۆر پێش ئەمە شارستانیەت لەو ناوچانەدا هەبوە.

لە نزیک ((مەکسیک)) هەرەمێکی پلەپلە هەیە کە بەشێکی گەورەی ژێرەوەی لەناو زەوی دا نوقوم بوە. جیولۆجەکان بێ ئەوەی گوێ بدەنە بیروڕای ئارکیۆلۆجەکان تەمەنی دروست کردنی ئەگێڕنەوە بۆ کاتی پێنج هەزار ساڵی پ.ز. کەواتە، ئەو هەرەمە لەو کاتەدا دروست کراوە کە، بەگوێرەی بیروڕای زانایان، شارستانیەتێکی پێشکەوتوو نەبوە مرۆڤ بتوانێ لەو شێوەیە دروست بکات !



ئـەو پشـكنين و تاقيكردنەوانـەی ((ب. س. كانيگسـۆم)) كردوونـی پشـتگيری تـەواوی بيـروڕای جيولۆجـەكان ئەكـەن. ئـەو زانايـە پـاش هەڵكەنـدن و شـی كردنـەوەی چـين چينـی زەوی دەوری هەرەمەكـە گەيشـتە بناغەكـەی و بـۆی دەركـەوت كـە تەمـەنی دروسـت كردنـی ئەگاتە پێنج هەزار ساڵەی پێش. ز.

لەپاش پشكنينی زۆر وردی زانياريانە بە هۆی ((راديۆ كاربۆن)) ەوە دەركـەوت كـە لەسـاڵی (٢١٦) پ.ز. دا هەرەمەكـە چۆڵ كـراوە و مرۆڤ بە جێ ی هێشتوە.

ئەگەر بڕوا بكەين كە تەمـەنی ئـەو هەرەمـە ئەوەنـدە درێژە كەواتـە ئـەبێ تەمـەنی پەيدا بـوونی مرۆڤـی ((ژيـر)) لـەو ناوچانـەدا زۆر لـەوە كۆنتر بێ !

هەروەها ئەتوانين ئەو نوسراوەی لەسەر تەلەبـەردێكی ئەمـەريكای ناوەڕاسـت هەڵكـەنراوە و ئەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی (١٢٠٤٢) ی پ.ز. بكـەين بـە بەڵگـە بۆ بـوونی شارسـتانيەتێكی پێشكەوتوو لەوكاتـەدا – ئەو شارستانيەتەی كە هيچی دەربارە نازانين.

نوسراوی زۆر لەمە كۆنتريش هەيە !

بێجگـە لەمـە، ئێسـتا زانايـانی ئـاركيۆلۆجی بەڵگـەی وايـان بەدەستەوەيە كە نەك تەنها بوونی مرۆڤ لـەم ناوچەيـەدا ئەسـەلمێنن بەڵكو شوێنەواری ئامرازی ئيش كردنيشی دەرئەخەن كـە ئەگەڕێتـەوە بۆ (٤٠٠٠٠) ساڵ پێش ئێستا !

کەواتە ئەمە ئەوە ئەسەلمێنێ کە پێش ڕوودانی کارەساتی ئەو لافاوەی باسمان کرد و مەبەستمانە لەو ناوچەیەدا شارستانیەت هەبوە. بەڵام ئاخۆ چەند بەرز بوە و پێشکەوتوو بوە ؟

هەمان پرسیار ئەتوانین دەربارەی شارستانیەتی میسر و سۆمەر و ئەمەریکای خوارووش بکەین.

ئەوەی ئاشکرایە یەکەم ((دەوڵەت)) لە دۆڵی نیل دا لە چوار هەزار ساڵەی پی.ز، دا دامەزراوە. ئەگەر ئەمە وابێ ئەی چۆن ئەو شتە سەیرە ڕوون بکەینەوە کە هیرۆدۆت[٤] و مێژوو نووسەکانی کاتی ئەو باسیان کردوە کە گوایا لەکاتی ئەوان دا دەستنووسی میسری هەبوە تەمەنیان (١٧٠٠٠) ساڵ بوە ؟

((مانیفۆن)) زانای ئاینی میسری سەدەی چوارهەمی پێش. ز. کە مێژووی میسری نووسیوەتەوە لەمەش کۆنتر باس ئەکات : بەساڵی (٣٠٦٢٧) ی پێش. ز. نووسینی مێژووەکەی دەست پێ ئەکات !

((سێنلوس)) ی مێژوو نووسی بێزەنتی باسی زەنجیرە نوسراوێکی میسری ئەکات کە لە لایەن زانا ئاینیەکانیانەوە بە ناوی ((هەواڵی کۆن)) ەوە بە درێژایی (٣٦٥٢٥) ساڵ نوسراوەتەوە. هەروەها ((دیۆگێن لایرت)) ی مێژوو نووسی یۆنانی سەدەی سێهەمی پاش. ز. بە دڵنیاییەوە ئەڵێ : ((زانایانی ئاینی میسری دەستنووسی وایان

---

٤ – هیرۆدۆت (دەوروبەری ٤٨٤ – ٤٢٥ پی.ز) بلیمەتترین مێژوونووسی یۆنان و جیهانی ئەوساو و ناسراو بە ((باوکی مێژوو)) چونکە یەکەم کەس بوو بە شێوەیەکی زانیاری و ڕێک و پێک مێژووی نووسیەوە . وەرگێڕ

پاراستوه کە ئەگەڕێتەوە بۆ (٤٨٨٦٣) ساڵ پێش ئەسکەندەری مەکدۆنی)) !



ئەم هەواڵانە ئەگەڕێنەوە بۆ ئەوکاتە دوورانەی کەبەرای زۆربەی زانایان نەک هەر ((مرۆڤی ژیر)) لەسەر زەوی نەبوە بەڵکو نووسینیش هێشتا پەیدا نەبوە ! دیارە ئەبێ بە گومانەوە بڕوانینە زۆربەی ئەم هەواڵانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێ هەمووی بەجارێک رەت بکەینەوە یان بەجارێک بەراستیان بزانین، چونکە هەتا ئێستا چەند هەواڵێک لەوانەی باسمان کردن و لە کۆنێکی زۆر دوورەوە پێمان گەیشتوون بە بەڵگەوە راستی یان سەلمێنراوە. بۆ وێنە، لە ساڵی ١٩٦٩ دا لە دۆڵی نیل هەندێک ئامرازی بەردین دۆزرایەوە کە مێژووی تەمەنیان ئەگەڕێتەوە بۆ (٧٠٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش – بۆ ئەو کاتەی بەڕای زانایان هێشتا مرۆڤ پەیدا نەبوە – ئەمەش هەندێک

لەو هەواڵانە ئەسەلمێنێ کە زۆر بە دڵنیایی یەوە نووسەرە کۆنەکان باسیان کردوە. ئەمە و هەندێک لەو دۆزینەوانەی لەمەودوا باسیان ئەکەین بەڵگەن بۆ سەلماندنی بوونی شارستانیەتێکی کۆنی پێشکەوتوو لەپێش ڕوودانی کارەساتی ئەو لافاوەدا کە لێ ی دواین.

لەمەوپێش باسی کەلاوەکانی شاری ((تیاخواناکۆ)) ی سەرشاخی ((ئاند)) مان کرد کە ڕۆژ ژمێرێکی سەیری (٢٩٠) ڕۆژەی لێ دۆزراوەتەوە. ئێستا ئەم شارە لەسەر شاخێکە کە چوارهەزار مەتر لەرووی زەریاوە بەرزە و بۆ ژیانی مرۆڤ زۆر شیاو نیە، لەگەڵ ئەوەشدا شوێنەواری بەندەرێکی زەریایی گەورە و پاشماوەی بەبەرد بوون و ئێسقانی گیان لەبەری زەریایی و نیگاری ماسی باڵداری لێ دۆزراوەتەوە، ئەمانەش هەموو بەڵگەن بۆ ئەوەی کە کاتی خۆی ئەم شارە زۆر نزیک بوە لە زەریاوە، یان وەک هەندێک زانایان ئەڵێن، یەکسەر لەسەر ڕۆخی زەریا بوە.


[ وێنە -٧- ]

ئەوەی شایانی باسە زانایانی جیۆلۆجی کاتی بەرزبوونەوەی شاخی ئاند ئەگێڕنەوە بۆ سێهەمین چاخی مێژوو، واتا بۆ ئەو کاتەی کە بە پێ ی ڕای زانایان، هێشتا لەسەر زەوی مرۆڤ پەیدا نەبوە ! کە لەم دواییەدا زانایان چوونە بن گۆمی ((مێتیکاکا)) ی نزیک ئەم شارەوە لە قووڵایی (٨) مەتردا



شـــــوێنەواری دیوارێکیـــــان دۆزیـــەوە کــە لــە تاشــەبەردی زۆر گــەورە دروســت کــراوە ! ئـــــەم دیوارانـــــە بەرامبـــــەر بەیــەکتری بــە هێڵێکــی راســت لەگـــەڵ ســـەکۆیەکی گـــەورەدا ماوەی کیلۆمەترێک زیاتر درێژ بوونەتـەوە. بـەرای پرۆفیسـۆر ((رۆبـن ڤێـل)) ی مامۆســـتای کـۆلیجی ئـارکیۆلۆجی شــاری ((تیاخوانـــاکۆ)) ئــەو دیوارانــە ((شــوێنەواری پەرەســـتگایەکی سەر رۆخی زەریایە کە گەورە پیاوانی شاری تێدا ئەنێژرا))).

کەلاوەی ئەم بینایە چۆن گەیشتۆتە بن ئەو گۆمە ؟

زانایـان ئـەم راسـتیە ئەگێڕنـەوە بۆکـاتی پەیـدابوونی شـاخ لـەم ناوچەیەدا، واتا بۆ ئەوکاتـەی، کـەوەک بـاس کـرا، هێشـتا مـرۆڤ پەیدا نەبوە.

ئەگـەر ئەمانـەوابن کەواتـە زۆر دۆزراوەی تـر کـە هێشــتا روون کردنـەوەیان دیـار نیـە و گرانـە هـۆی پەیـدا بوونیـان بزانـرێ، ئاشـکرا ئەبن.

کاتی خۆی لەسەدەی شازدەهەمدا لەناخی کانـەزیوێکی ((پیرۆ)) دا ئیسـپانیەکان بزمـارێکی (١٨) سـانتیمەتری یـان دۆزیوەتـەوە. بەشـی

زۆری ئەو بزمارە، لەگەڵ بەردەکانی دا تێکەڵاو بووبوو وە بووبوون بەیەک پارچە ئەوەی ئەگەیاند کە دە هەزار ساڵ ئەو پارچەیە لەناخی زەوی دا ماوەتەوە. نوێنەری شای ئیسپانیا لە پیرۆ ((فرانسیسکۆ دی تۆلیدۆ)) ماوەیەکی زۆر ئەو بزمارە سەیرەی لە ژووری ((میوان)) دانابوو و پیشانی میوانەکانی ئەدا وەک دۆزراوەیەکی نایابی دانسقە.

ئەمە یەکەم دۆزراوەی لەم جۆرە نیە، بۆ وێنە، لە یەکێک لەکانی خەڵوزی بەردینەکانی ئوسترالیادا پارچە میتیۆرێکی ئاسن دۆزرایەوە کە نیشانەی دەستکاری کردن و نەخشاندنی مرۆڤی پێوەبوو و ئەگەڕێتەوە بۆ بەشی سێهەمی مێژوو – واتا ئەبێ دەستی ((مرۆڤی ژیر)) ی پێش (٣٠) ملیۆن ساڵ گەیشتبێتێ.

گۆڤاری ((هەواڵی کۆمەڵەی مێژووی کۆن)) ی سکۆتلاندی بڵاوی کردەوە کە پارچە ئاسنێک لەناو پارچە خەڵووزێکی بەردینی گەورەدا لە سکۆتڵەندا دۆزراوەتەوە.

هەواڵێکی تریش ئەڵێ کە لەساڵی ١٨٩١ دا زریزەیەکی زێڕ لەناو پارچە خەڵووزێکی بەردین دا لەناخی کانگایەکی خوڵووزدا دۆزراوەتەوە.

زۆربەی مێژوونووسان بە گومانەوە ئەڕواننە ئەم جۆرە دۆزینەوە و هەواڵانە. ئێمە نابێ پەلە لە سەلماندن یان بکەین هەتا چەند جۆرە دۆزینەوەیەکی تر بەشێوەیەکی زانیاری وا نەخرێتە بەر تیشکی زانینەوە کە گومان نەهێڵێ.

گومان کردن لەکاری وا و بەئاسانی وەرگرتنیان هەر تەنها لەبەر ئەوە نیە کە زانیاری هەتا ئێستا زۆرجار لە ئەنجامی بڕیاردانی پەلەدا

بەهەڵـە چـوە بـەڵكو لەبـەر ئەوەشـە كـە زۆرجـار مـرۆڤ گیـرۆدەی بیـروڕای ئـەو كۆمەڵەیـە كـە تیایـا ئـەژی و ژیرتـرین مێشـك نـاتوانێ هـەموو كاتێـك و بەیـەكجاری لـەو بیروڕا و نەریتانـە لابدات كـە لـەو كۆمەڵـەدا چەسـپاوە و كۆمـەڵ بەراسـتی ئـەزانێ. بۆ وێنـە، جارێـك لـە ((ئەلبێرت ئەنیشتاین)) ی زانای هەرە بەناوبانگیان پرسـی ئایـا بڕوای بەوە هەیە كە ئەتوانرێ لەماوەی (١٠٠) ساڵی داهـاتوودا وزەی ئـەتۆم بگیرێتە دەسـت و مرۆڤایـەتی بەسـەری دا زاڵ ببـێ ؟ ئـەو زانـا مەزنـە بەبێ چەند و چوون و بە دڵنیاییەوە وەڵامی دایەوە : ((نەخێر، ئەمە لە تواناادا نیە !)) بەڵام هەمووی دە ساڵ بەسەر ئەم وەڵامەدا تێ نەپەڕی یەكەم بۆمبای ئەتۆمی تەقێنرا !

ئەگەر لەپاشە ڕۆژدا ئەو دۆزینەوانەی باسمان كردن بە بەڵگـەوە بسـەلمێنرن وا تەمـەنی مێـژووی پەیـدابوونی مـرۆڤ لەسـەر زەوی زۆرلەوە دوورتر ئەكەوێتەوە كە هەتا ئێستا باوە.

ئـەوەی شـایانی باسـە دۆزینـەوەكانی ئـەم دواییـەش بەڵگـەن بـۆ بوونی مرۆڤ لەسەر ڕووی زەوی زۆر لەپێش ئەوەدا كە هـەتا ئێسـتا سەلمێنراوە.

بۆ وێنە : لە ١٩٥٩ دا ((ل. لیكی)) كەللە سەرێك و چەند ئامرازێكی بەردینی دۆزیەوە كە بە جارێك (٦٠٠٠٠) ساڵ تەمـەنی پەیدا بوونی مرۆڤی درێژ كردەوە و گەیاندیە (٢٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەوپێش لەهەمان ١٩٥٩ دا تیپێكـی زانایـانی ئـاركیۆلۆجی بـەلچیكی و فەرەنسـی و ئەمەریكی لـە خـوارووی ((ئیفیۆپیا)) دا چەنـد شـوێنەوارێكی نـوێ یـان

دۆزیەوە کە کاتی پەیدا بوونی مرۆڤیان لەمەش دوورتر خستەوە و گەیاندیانە (٤٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەوپێش.

بەمجۆرە، ماوەی مێژوو (راستر وایە بڵێ ین ماوەی پێش مێژوو) دوو ئەوەندە درێژ بوەوە. ئەمەش، واتا درێژیی تەمەنی مرۆڤایەتی، سەلماندنی بوونی شارستانیەتی وایە لەسەر زەوی، کە ئێمە هیچی دەربارە نازانین.

بەڵگەیەکی تریش بۆ بوونی شارستانیەتێکی پێشکەتوو لە پێش کارەساتی لافاوەکەدا ئەو هەوڵ و دۆزینەوانەن کە ئەیسەلمێنن گوایا مرۆڤایەتی هەوڵی داوە هەندێک زانیاری لە لافاوەکە بپارێزێت و لە لەناوچوون رزگاریان بکات.

**((هەوڵی رزگار کردنی زانیاری))**

((ئێمەی بلیمەت و شاعیر، پارێزەری
نهێنی و بڕوا، مەشخەڵی نەکوژاوە
هەڵئەگرین بۆ روناک کردنەوەی زیندانی
ژێر زەوی و بیابان و ئەشکەوتەکان))
((ڤ. بریوسۆڤ))

زانای عەرەبی سەدەی (٩ – ١٠) ئەبوبەکر بەڵخی [١] نووسیوە : ((کە شارەزایان و بلیمەتان زانیان کارەساتی لافاوێکی جیهانی نزیکی روودانە، لە خوارووی میسردا ژمارەیەکی زۆر هەرەمیان لەبەرد دروست کرد بۆ ئەوەی لەکاتی کارەساتە کوشندەکەدا خۆیانی تێدا بشارنەوە و خۆیان لە مردن رزگار بکەن. دووانیان لەوانی تر بەرزتر بوون و پانی و بەرزی یان ئەگەیشتە نزیکەی (٤٠٠) گەز. ئەو هەرەمانە لەبەردی گەورە گەورەی لووس کراو دروست کرابوون و بە جۆرێکی وا خرابوونە پاڵ یەک بە گران درزی نێوانیان ئەبینرا))

بەقسەی ئەبوبەڵخی ((دیواری ناوەوەی ئەم هەرەمانە بە نوسراوی ئەو زانیاریە پێشکەوتوو، و سەیرانە رەش کرابوونەوە کە بەلیمەتەکان ویستبوویان لە فەوتان رزگاریان بکەن.))

((مەسعودی)) لەچەند سەرچاوەیەکی کۆنەوە کە بە ئێمە نەگەیشتوون نوسیویەتی : ((سووریدی شا کە لەپێش لافاوەکەدا ژیاوە دوو هەرەمی دروست کرد و فەرمانی بە زانا ئاینی یەکان دا

١ - لەوە ئەچێ نوسەر بۆیە بە عەرەبی داناوە کە بە عەرەبی کتێبی نووسیوە . وەرگێڕ

که دەستنووسی زانیاری یەکانیان تێدا بشارنەوە بۆ ئەوەی ئەوانەی پاش ئەمان دێن تێ یان بگەن. هەمان شا شوێن و ڕێگا و چۆنیەتی هات و چۆ و جۆری ئەستێرەکانیشی نووسیەوە.))

((مانیفۆن)) ی مێژوو نووسی میسری کۆن دەربارەی ئەو نوسراوە بەنرخانە ئەدوێ کە لەکاتی نزیک بوونەوەی کارەساتی لافاوەکەدا لە لایەن ((تۆتخ)) ی بلیمەتی نیمچە ئەفسانەییەوە نووسراوەتەوە.



ئەوسا ((تۆتخ)) چوە پەرستگای خواکان و وەک ((خوای زانین)) نووسراوەکانی لەوێ شاردەوە. بەقسەی ((مانیفۆن)) ئەو نوسراوانە کە بە (نیشانە و زمانێکی پیرۆز لە لایەن تۆتخ ەوە نوسراونەتەوە لەپاش لافاوەکە

تەرجومە کراون (....) [2] و بە شێوەی هیرۆغلیفی نوسراونەتەوە)).

مێژوونوس و زانای کۆن ((یوسف فلاڤیی)) دەربارەی ئەو بلیمەتانە نووسیویەتی کە ((زانیاری یان دەربارەی ئەستێرەکان و لەشە ئاسمانی یەکانی تر و دروست بوونیان هێناوەتە گۆڕێ)). بەقسەی ئەو زانایانە پێش لافاوەکە ئاگاداری رووداني کارەساتێکی وا کرابوون کە ئەبێتە هۆی لەناوچوونی مرۆڤایەتی : ((هەندێکیان بە هۆی ئاگرەوە و هەندێکیان بە هۆی لافاوەوە)) یوسف فلاڤیی لەمبارەیەوە زیاتر ئەنووسێ و ئەڵێ :

  

((... ئەو بلیمەتانە بۆ ئەوەی ئەو زانیاریانەیان نەمرێت و خەڵک بتوانێ فێریان ببن دوو پایەی گەورەیان دروست کرد، یەکێکیان لە خشت و ئەوی تریان لەبەرد و ئەو زانیاری یانەیان لەسەر نووسیەوە کە دەربارەی ئاسمان ئەدوا. پایەی دووهەمیان وا دروست کرابوو کە

---

٢ - ئەم جێگایە لە ئەسڵی دەستنووسەکەی ((مانیفۆ)) دا کوژاوەتەوە .

ئەگەر یەکەمیان لافاوەکە خستی دووهەمیان خۆی بگرێت و بمێنێتەوە بۆ خەڵک)) بە قسەی ((فلاڤیێ)) پایە بەردینەکە لە کاتی ژیانی ئەودا – واتا لەسەدەی یەکەمی زایین دا – هێشتا هەر مابوو !!

((ستراربۆن)) ی زانای یۆنانی کۆن دەربارەی ئەو نوسراوانە ئەدوێ کە لە پێش لافاوەکەدا هەبوون و هەتا کاتی ئەو لە نیمچە دۆرگەی ((پیرێ)) دا مابوونەوە.

زانا ئاینی یەکانی ((کیلت)) لە ژیانیان دا کەڵکیان لەو کتێبە کۆنانە وەرگرتوە کە پێ یان وتوون ((کتێبەکانی فێریلاتی)) و لە پێش کارەساتی لافاوەکەدا نوسراونەتەوە.

لە کتێبی پیرۆزی ((ئاگین پووڕانا)) و ((بخاگاڤاتا پووڕانا)) ی هیندی یەکان دا دەربارەی کتێبەکانی ((ڤێد)) ئەدوێن کە توانراوە لە کاتی لافاوەکەدا رزگار بکرێن.

((بیرۆز)) ی مێژوونووسی بابلی سەدەی سێهەمی پێ.ز. دەربارەی ئەوەی نووسیوە کە مرۆڤایەتی پێش لافاوەکە هەوڵی داوە زانیاری رزگار بکات. لەم بارەیەوە ئەڵێ : ((کەکسیسۆترۆس)) لە نزیک بوونەوەی لافاوەکە ئاگادار کرا فەرمانی دا مێژووی سەرەتا و بەردەوامی و کۆتایی هەموو ((شتێک)) بنووسنەوە و لە شاری سیپارەی خوای رۆژدا بیخەنە ژێر خاکەوە.

پاش لافاوەکە ((کسیسۆترۆس)) و هاورێکانی کتێبەکانیان لە ژێر خاک دەرهێنایەوە و کتێبی تازەیان نووسیەوە و سەرلەنوێ بابلیان دروست کردەوە)).

پادشـــایەکی ســۆمەری لــە دەستنووســێک دا نووســیویەتی کــە هەمیشــە حــەزی کــردوە ئــەو کتێبانــە بخوێنێتــەوە کــە ((لــە پــێش لافاوەکەدا نوسراونەتەوە !))

بەم جۆرە، ئەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێ ین کە توانراوە هەندێک لەو زانیاریانـەی پـێش لافاوەکـە کـە هـەبوە بپارێزرێن و لـە مـردن رزگـار بکرێن.

زانایەکی ئاینی کۆنی میسری بە ((سۆلۆن)) ی وتوە ((ئای سۆلۆن !، ئێوەی یۆنانی وەک منداڵ وان و شارەزای مێژووی کۆن نین، ئێوە هیچ دەربارەی ئەو زانیاریە پیرانە نازانن کە لە کۆن دا هـەبوون.)) هـەمان زانـای ئـاینی بـە سـۆلۆنی وت : ((لـەکاتی لافاوەکـەدا هـەموو دانیشتوانی شارەکانی سەر زەریا و رووبارەکان لـەناوچوون و تـەنها ئـەو شـوان وجوتیـارە نەخوێندەوارانــە رزگاریــان بــوو کــە لەســەر شاخەکان کاریان ئەکرد.))

ئاشـکرایە کـە هەرچەنـدە شارســتانیەتێکی بــەهێزیش بــووبێ و هەوڵیان دابێ زانیاریەکانیان بپارێزن و بەشێکیان لە لافاوەکە رزگـار کردبێ لەوەپاش بە هۆی کارەساتی سروشتی و تیرە ((درندەکانەوە)) لەناوچوون !

لەناوچوونی زانیاری نەک هەر تەنها لە رابردووی کۆن دا رووی داوە بــەڵکوو لــە مێــژووی تازەشــدا نموونــەی ئەمــە زۆرە، وەک ئاشکرایە لە سەدەی (١٤ – ١٥) دا لە ئەمەریکای ژووروو هێشتا جێ نشـینگەی ((نۆرمـان)) ەکـان مـابو و لـەم شـوێنە تازەیـەیان دا ئـەیان توانی ((مەعدەن)) بتوێننەوە و کەل وپەلی پێویستی لێ دروست بکەن. بــەڵام کــە بــە چەنــد تیرەیــەکی ((درنــدە)) و نــەزان دەورگیــران و

پەیوەندی یان لەگەڵ نیشتمان و گەلی نەژادیان دا پچڕا، بەرەبەرە ئەوەی ئەیان زانی لەبیریان چوەوە و کەوتنە دۆخی نەزانی سەدە بەردینەکانەوە.

کاتی خۆی لەشاری ((تیاخوان کۆ)) ی سەر شاخی ((ئاند)) دا میللەتێک ئەژیا شارەزایی تەواوی هەبوو لە گەردوون ناسی و هات و چۆی ئەستێرە و لەشە ئاسمانی یەکان و مەعدەن سازی دا. کە ئیسپانیەکان چوونە ئەو شارەوە کەسی تێدا نەبوو، بەڵام پەیکەری بەردینی وایان دی کە هەندێکیان خشڵی زیوی دارێژراویان پێوە بوو سەنگیان ئەگەیشتە نیو تەن ! لەکاتێکدا کە ئەو تیرە و خێڵانەی لە دەوروبەری ئەو شارە ئەژیان هیچیان دەربارەی تواندنەوەی مەعدەن و گەردون ناسی نەئەزانی و لە کۆخی لەقی دار دروست کراودا ئەژیان و خواردنی سەرەکی یان بریتی بوو لەبەر و رەگی درەختی ئاوی.

نموونەیەکی تر : لەکاتی خۆی دا گەلی ((ماوری)) گەلێکی مەزنی زەریاوانی ئۆقیانووسی هێمن بوون بەڵام پاش ئەوەی لە خاکی ((نیوزیلاند)) دا نیشتەجێ بوون بەرەبەرە ئەم کارەیان لەبیر چوەوە و نەوەکانیان وایان لێ هات هیچیان دەربارە نەئەزانی.

زانایانی مێژوو، و ئێتنۆگراف ئەم دۆخانە بە ((دڕندەیی دووهەم جار)) ناوئەبەن. ئەوەی شایانی باسە ئەمە لەناو میللەتانی جیاجیادا بەدی ئەکرێ.

لە خوارووی رۆژهەڵاتی ئاسیادا زۆر تیرە هەن کە گەڕاونەتەوە بۆ ئاستی سەدەی بەردین. گەلانی کۆنغۆ و ئەنگۆلا کاتی خۆی نووسینی تایبەتی خۆیان هەبوە و لەبیریان چۆتەوە.

وەک ئاشـکرایە گـەلی ((مـای)) [٣] دەربـارەی رەورەوە هیچیـان نەزانیوە، بەڵام لەراستیدا ئەمە وانیە. لەکاتی پشکنینی ئەو ناوچەیەدا ((عەرەبانە)) ی چوار رەوڕەوەیی یاری منداڵانی لە سواڵەت دروست کراو دۆزراوەتەوە. ئەمەش دیارە یادگاری ئەو کاتە بە بیری ئەو گەلـە هێناوەتـەوە کـە خـاوەنی رەورەوە و عەرەبانـە و ئـامرازی گواسـتنەوەبوون و وەک زۆربـەی زانیـاری یـەکانی تـر لـەبیریان چوونەتەوە.

دەربارەی لەناوچوونی زانیاری گەلان لەئەنجامی لافاوەکەدا لە زۆر نوسراودا هەواڵ هەیە. بۆ وێنە ((پەپۆل – ڤوخ)) ئەڵێ کە مرۆڤی پێشـوو ئـەیانتوانی هـەموو شـتێکی جیهـان بـزانن، بەرادەیەکی وا لە جێگـای خۆیـان دائەنیشـتن و بـێ ئـەوەی بجووڵێنـەوە لەبـەرزایی ئاسـمانەوە هـەتا نـاخی زەوی چـی تێدا بـوو ئـەیان بینـی، هـەتا نـاو رەشترین تاریکیشیان بەدی ئەکرد. بە کورتی هـەموو گەردوون یان ئـەبینی.. بلیمـەتی یـان گەیشـتبوە ئەوپـەڕی سـنوور.. بـەڵام خواکـان ئەمـەیان پێ خۆش نـەبوو و وتیـان : ((ئـەوە چیە، ئـەڵێ ی ئەیانـەوێ ئـەوانیش بـبن بـەخوا، ئایـا ئـەبێ رێگـای ئـەوە بـدەین ئـەوانیش وەک ئێمەیان لێ بێت ؟.)) ئەوسا ئەو خوایانە بلیمـەتی و زانیاری یـەکانیان لێ سەندنەوە.

---

٣ – ژیانی گەلی ((مای)) و شارستانیەتە مەزنەکەی باسێکی زۆر قووڵ و بەتامە . هەل بـوارە بـدات کتێبـە نایابەکـەی ((ئەلێکسـاندەر کەنـدراتۆڤ)) دەربـارەی ئـەو گەلـە بلیمەتـە بەکوردی لەچاپ ئەدەین . وەرگێڕ

لەلایەکی ترەوە، بەزۆر شێوەی ((رەمزی)) هەواڵی لەناوچوونی شارستانیەتێکی بەرزمان لە ئەنجامی کارەساتی لافاوەکەدا پێگەیشتوە.

دەستنووسێکی میسری کۆن لەم روەوە ئەڵێ : ((دوژمنەکانی لەناوبرد و زانیاری یەکانی قووت دا.)) زاراوەی ((قووت دان)) ی زانیاری لە ئینجیلیش دا بەرچاو ئەکەوێ. لەوێدا دەربارەی درەختێک ئەدوێ کە ئەگەر مرۆڤ بەرەکەی ((قووت)) بدات ئەمەندە شت فێر ئەبێ ((وەک خوا ئەتوانێ چاکە و خراپە بزانێ)) – واتا ئەگاتە لوتکەی بەرزی زانیاری. کە ئادەم و حەوا بەقسەی خوایان نەکرد و لەبەری ئەو درەختەیان خوارد، خوا – هەروەک خوای مەکسیکی کۆن – تووڕە بوو، و ووتی : ((وا ئادەم بوو بە یەکێک لە ئێمە و چاکە و خراپە فێر بوو. نەکات دەست درێژی بکات بۆ درەختی ((ژیان)) و لەویش بخوات و ببێتە مرۆڤێکی نەمر !))

رەمزی درەختی ((زانین)) لە ئەفسانە و نوسراوی زۆربەی گەلان دا بەرچاو ئەکەوێ، بۆ وێنە : لە بابلی کۆن و لای ئاتسی یەکان (وێنە ١٣ و ١٤). ئەفسانەی ئیرلەندی باسی ((توماس)) ناوێک ئەکات کە پاش ئەوەی بەری درەختی ((زانین)) ی خوارد هەموو شتێک ((فێربوو)) و هەموو شتێکی ((ئەبینی)).




لەژێر درەختێکدا ((بوودا)) وەحی بۆ هات و لەپڕ هەموو گەردون و جیهانی لەبەرچاو کرایەوە. زۆرجار ئەفسانە هیندی یەکان وێنەی ((ڤیشنو)) ی خوا لەژێر داری ((ئاسمانی)) دا ئەکێشن کە بەرەکەی نیشانەی زانینی رابردوو، و پاشە رۆژە.

لە یابان دار پرتەقاڵ ئەم رۆڵە ئەبینێ، لەچین داری کاسیا و لەرۆژهەڵاتی نزیک داری سیاکامۆرا و لای ((دوید)) ەکان دار بەڕوو ئەم کارەیان پێ سپێرراوە و هتد...




لێرەدا شتێکی گرنگمان دێتە بەرچاو : هەمیشە لەگەڵ باسی درەختی ((زانین)) دا باسی کارەساتی لافاوەکە دێتە گۆڕێ، واتا سێ رەمزە نەگۆڕاوەکەی مار (یان ئەژدیها) و ئاو و درەخت ! (وێنە – ١٥ -) بەم جۆرە، لە ئەفسانەی کۆنی ((گیل)) دا درەختی ((زانین)) کە خواردنی بەرەکەی مرۆڤ ئەگەیەنێتە لوتکەی تێگەیشتن، ئەژدیهایەک، کە لە گۆمێک دا ئەژی، رێ ی لەخەڵک گرتوە بیگەنێ. (وێنە – ١٥)

لە ئەفسانەی کۆنی یۆنانی دا ماری ((لادۆن)) درەختەکەی ((زیوس)) ئەپارێزێ کە بەری

قۆناغەی زێڕ ئەگرێ. هەرقل بۆ دەستخستنی ئەو بەرانەی ناچار بوو ئەو ماره بکوژێ.




(وێنە – ١٦) ((نانیفێر کاپتاخ)) ی میسری کۆنیش ئەو ((مارە نەمرە)) ی کوشت کە باسی کتێبە جادوگەری یەکانی ئەکرد.هەمان وێنە لە ئەفسانەی سۆمەری یەکانیشدا ئەبینین. (وێنە – ١٧)



بوودی یەکانی یابان و چین و هیندستان ئەڵێن ماری ((ناگا)) کە نیشانەی لافاوە – لەگۆم دا ئەژی و رێگا نادات بەکەس لەو درەختە پیرۆزە نزیک بێتەوە کە خواردنی بەرەکەی چاوی مرۆڤ وا بەهێز ئەکات هەموو رابوردوو ببینێ.

((ئەفسانەی گەلە سلاڤی یەکانیش لەهەمان شت بێ بەش نیە. یەکێک لە ئەفسانەکانیان ئەڵێ : ((لە دۆرگەی ((بۆیان)) لەژێر دار بەروویەک دا بەردی ((ئەناتیر)) شاردراوەتەوە کە کانگای بلیمەتی و زانینە و ماری ئاگرینی ((گارافینا)) پاسەوانی ئەکات و ئەیپارێزێت)).

له ((مەكسیک)) یش تلالۆکی خوای ئاو، و لافاو رێگای لە خەڵک گرتوە بگەنە داری ((کاکتووس)) ی پیرۆز، کە لە رۆخی گۆمەکە رواوە. (وێنە – ١٨)



بەم جۆرە، لە ئەفسانەی زۆربەی گەلانی لەیەک دووردا ((مار)) نیشانەی کارەسات و لافاوە و رێگای لەبەدەست خستنی داری پیرۆزی ((زانین)) گرتوە. زۆر رێ ی تێ ئەچێ کە هەر ئەمەش بووبێ بەهۆی ئەوەی ((ئاتسی)) یەکان ((تاموانمان)) ی نیشتمانی لەدەست چوویان بەدرەختێکی شکاو نیشان بدەن. بەلام وەک نووسەرە کۆنەکانی وەکو ئەبوبەلخی و مانیفۆن و فلاڤێی و سترابۆن و ئەوانی تر باسی ئەکەن، توانراوە بەشێک لەو ((زانین)) انە لەفەوتان رزگار بکەن. دیارە ژمارەیەکی کەمی خەڵک توانیویانە لەناو کۆمەڵەی نیمچە درندە و نەزانی پاش لافاوەکەدا ئەو زانیاری یانە بپارێزن. بۆ وێنە، لە دورگەکانی بەریتانیا ((درۆیید)) [٤] و لە هیندستان ((براهما)) و لەمیسر ئەوانەی بە زانایانی ئاینی ناومان بردن ئەم کارەیان لە ئەستۆ گرتوبوو. لەوەپاش کە لە میسر ((دەوڵەت)) دروست بوو ئەو زانا ئاینیانە بەراستی دەوری ئاینی یان وەرگرت و لەبەر فراوانی رادەی زانینیان بوونە دەسەلاتداری راستەقینەی ولات و فەرمان رەوایی ئاینی یان چەسپاند.

---

٤ – درۆیید : druides . وشەیەکی فەرنسی یە : پیاوانی ئاینی کۆنی ((کیلت)) و بەریتانیا و ئیرلەندە کە دەوری ((دادپرسی)) شیان ئەبینی . وەرگێر

دیاره بەدرێژایی هەزارەها ساڵ ئەو جۆره کەسانە ((زانین))ەکانیان فێری نەوەکانی خۆیان کردوە و نەیان هێشتوە کەسی تر پێی بزانێ. وەک هیرۆدۆتی ((باوکی مێژوو)) ئەیگێڕێتەوە زانایەکی ئاینی میسری لە یەکێک لە پەرستگاکان دا پەیکەری بچووکی (٣٤١) سەرۆکی زانا ئاینی کانی پیشان داوە کە یەک بە دوای یەکدا هاتوون. بە لێ وردبوونەوەیەکی ئاسان ئەتوانین بیسەلمێنین کە فەرمان رەوایی ئەمەندە سەرۆکی ئاینی لە (١٠٠٠٠) ساڵ کەمتر ناخایەنێ. بە واتایەکی تر، سەرەتای ئەو فەرمان رەواییە ئەگاتەوە کاتی کۆتایی هاتنی کارەساتی لافاوەکە.

ئەتوانین بڵێ ین کە زۆر لەو ((پارێزەری زانیاری)) یە کۆنانە ویستوویانە پەرەسەندنی لەسەر خۆی مرۆڤایەتی خێراتر بکەن بەوەی ئەو شتانەیان فێر بکەن کە لە شارستانیەتە کۆنەکانەوە پاراستبوویان. لەم بارەیەوە زۆربەی ئەفسانەی میللەتان باسی ئەو کەسانە ئەکەن کە نەزانراوە لە کوێوە هاتوون و لەپڕ پەیدا بوون و زانیاریان فێری خەڵک کردوە.

بێ گومان پێش هەموو ئەمانە مرۆڤ ((پرۆمیتێ ی)) [٥] دێتەوە یاد کە هەوڵی دا خەڵک فێری ئاگر کردنەوە بکات.

لەم جۆره کارانەدا ((پرۆمیتێ ی)) تاکەکەس نەبوە، لە ئەمەریکای خواروو ((مانکوکاپاک)) یەکەم کەس بوو لەودیو زەریاوە هات و خەڵکی فێری کشت وکاڵ کرد.

---

٥ – پرۆمیتێ ی : Prometheus لە ئەفسانەی کۆنی یۆنان دا کوڕی ئۆران ( ئاسمان ) و گێ ی ( زەوی ) یە . ئاگری لە ئاسمان رفاند و پیشانی خەڵکی دا . زیوس لەسەر ئەمە تووڕە بوو ، و بەزنجیر لەسەر (کێوی قاف) بەستیەوە و هەموو رۆژێک هەڵۆیەک بەدەندوک جگەری هەڵئەکۆڵی . شەوێ پڕ ئەبوەوە و بەیانی دووبارە هەڵۆکە ئەکەوتەوە سزادانی . وەک ئەڵێن لەوەپاش هەرقل رزگاری کرد . وەرگێڕ

((یۆجیا)) ی پیرەمێردی ریش تۆپزی کە لە رۆژهەڵاتەوە هاتبوو خەڵکی فێری دروست کردن و بەکار هێنانی ((رۆژ ژمێر)) کرد. ئیسامنا (کە بە یوکەتان، یان ساناش ناسراوە) لە رۆژهەڵاتەوە و لەودیو ئۆقیانووسەوە هات بۆ ئەمەریکای خواروو، خەڵکی فێری ئاژەڵ بەخێو کردن و تۆوچاندن و پرد دروست کردن و داربڕینەوە کرد. ئەفسانەکان ئەڵێن کە گوایا هەر ئەویش ((نووسین))ی لەگەڵ خۆی هێناوە و خەڵکی فێری نووسین کردوە. لەهەموو ئەمانەش دیارتر ((کێسال – کواتیل)) ە کە لە رۆژهەڵاتەوە هات بۆ مەکسیک و فێری میتال سازی و کشت وکاڵی کردن.

دەربارەی ئەو پاڵەوانانەی زانیاری یان بۆ خەڵک هێناوە و فێری شتیان کردوون لە ئەفسانەی گەلانی ئاسیای خواروو، و ئاسیای نزیکیش دا جێگایەکی باشیان هەیە.

بۆ وێنە، ((بیرۆز)) ی مێژوونووسی بابلی باسی ((گیان لەبەر)) ێکی سەیر و خەیاڵی ئەکات کە ناوی ((ئۆانیس)) ە و تاوەناتاوێک پەیدا بوە و خەڵکی فێری زانین کردوە و ئامۆژگاری بە کەڵکی داونەتێ. بە قسەی ((بیرۆز))، ئۆانیس خەڵکی فێری خوێندنەوە کردوە و هونەری جیاجیای پیشان داون و فێری دروست کردنی شار و پەرستگای کردوون و یاسای بۆ داناون و یاسای زانیاری ئەندازەی پیشان داون. لێرەدا، لەقسەکانی لەوەپاشی ((بیرۆز)) ەوە خاڵێکی سەیرمان بۆ دەرئەکەوێ :

ئۆانیس چونکە لەدیو زەریاوە هاتبوو نەیئەتوانی ئەو خواردنانە بخوات کە خەڵکی تر ئەیان خوارد و بە زمانێک ئەدوا کەکەس نەیئەزانی.

لەکاتی عیسایيشدا لە ((ئەپۆکریڤ)) [٦] ی ((کتێبی ئینۆخ)) دا باسی ((گیان لەبەر)) ێک ئەکات کە ((زانین)) ی بۆ خەڵک ئەهێنا. نووسەر ئەو ((گیان لەبەرانە)) بە مەلائیکەت ناو ئەباو ئەنووسێ : ((عەزازیل خەڵکی فێری دروست کردنی شیر و چەقۆ و رم و قولاپ کرد و فێریشی کردن هەرشتێک لە پشتیانەوەیە ببیینن. ((باراکیال)) و ((تیمپێڵ)) فێری حیساب و ((ئاسرادێل)) چوونیەتی گەڕانی مانگی پیشان دان)).

دانیشتوانی دۆرگەی ((پاسک)) باسی ((ماکی – ماکی)) مەزنیان ئەکەن کە فێری بەکار هێنانی تۆڕی ماسی گرتنی کردوون، بە پێ ی ئەفسانەی ئەوان ئەو ((ماکی – ماکی)) یە لەوەپێش شای دۆرگەی ((مۆتۆ – ماربۆ – هیڤا)) بوە کە نوقومی ئۆقیانووس بوە !

ئەوەی مەبەستمانە بیڵێ ین ئەوەیە کە باسکردنی ئەم جۆرە زانایانە لە لایەن خەڵکی ئەوساوە لەشێوەی ((خوا)) دا نابێ سەرمان سوڕبمێنێ. مێژوو زۆر نموونەی وای هەیە کە لەگەڵ پاڵەوانە گرنگەکانی خۆی بردۆتە ریزی خواوە. بۆ وێنە، کە ((کادم)) ی زەریاوان نووسینی هێنایە یۆنان بە ((رەسمی)) بە ((نیمچە خوا)) ناسرا.

هەرچۆنێک هەبێ لە ئەفسانەی زۆربەی گەلانی سەر زەوی دا باسی ئەو زانایانە کراوە کە زانیاری یان بۆ خەڵک ((هێناوە)) و فێریان کردوون.

* * * *

---

٦ – ئەپۆکریڤ apokryphos وشەیەکی یۆنانی یە : ئەو نوسراوە ئاینیانەی کە ناوەڕۆکیان لە ناوەڕۆکی ئینجیلەوە نزیکە بەلام وەکو نوسراوێکی ئاینی بەرەسمی ناژمێردرێ . وەرگێر

**((زانین لەشوێنی نەزانراوەوە))**

**((با بچینە ناخی کتێبە نەناسراوەکانەوە**

**سەرنج لە وشە بەوشەی ناوەکان بدەین**

**گۆرانی بە زمانە بێگانەکان بڵێ ین**

**ئەوسا لەکەمەوە زۆرمان بۆ دەر ئەکەوێ))**

((ف. بریوسۆڤ))

دەربارەی ئەو بەشە زانیاریە بەرزانەی لەکارەساتی لافاوەکە رزگاریان بوە هەندێک راستی تریش دێتە بەرچاو کە ئەگەڕێنەوە بۆ یەکەم شارستانیەتی کۆنی نەناسراو لای مرۆڤایەتی ئێستا ، ئەمانەی باسیان ئەکەین بەڵگەن بۆ ئەمە :

**١ – بەڵگەی ئەسترۆنۆمیا و کۆسمۆگۆنیا** [٧]

((مای)) یەکان هەرچەندە نە رەورەوەیان بەکار هێناوە و نە ئاسنیان ناسیوە لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر شارەزای سووڕاندنەوەی ئەستێرە و لەشە ئاسمانی یەکان بوون.

بە پێ ی رۆژ ژمێری ((گریگۆری)) زەوی بە ٢٤٢٥٠٠ ر ٣٦٥ رۆژ جارێک بەدەوری رۆژدا ئەسووڕێتەوە. ((مای)) یەکان ئەم کاتەیان بە ٢٤٢١٢٩ ر ٣٦٥ رۆژ داناوە.

---

٧ – کۆسمۆگۆنیا : Kosmogonia وشەیەکی یۆنانی کۆنە ( واتا پەیدابوون ) : بەشێکە لە زانیاری ئەسترۆنۆمیا کە لە پەیدا بوون و پەرەسەندنی ئەستێرە و لەشە ئاسمانی یەکان ئەکۆڵێتەوە . وەرگێڕ

ئێستا بە یارمەتی وردترین و تازەترین و بەهێزترین ئامرازی ئەسترۆنۆمی سووڕاندنەوەی زەوی بەدەوری رۆژدا بە ۲٤۲۱۹۸ ر ۳٦٥ رۆژ دائەنرێ.

کەواتە، هەتا ئەم چەند ساڵەی دواییە ئەو ژمارەیەی ((مای)) یەکان وتوویانە راسترین ژمارە بوە. ئەوەی شایانی باسە ((مای)) نە تەلسکۆبی زانیوە و نە ئامرازێکی تر !

((مای)) سووڕاندنەوەی مانگیان بەدەوری زەوی دا بەوردی هەتا (٤٠٠٠ ر ٠) ی رۆژێک زانیوە !!

لەپڕ ئەسترۆنۆمی وا پێشکەوتوو لە ولاتی سۆمەریش دا دەرئەکەوێ. لێرە سووڕاندنەوەی مانگیان بە وردی هەتا (٤ ر ٠) سانیەیەک زانیوە ! درێژی ساڵیان بە ۳٦٥ رۆژ و ٦ سەعات و ۱۱ دەقیقە داناوە کە ئەمەش لەگەڵ ئەو ژمارەیەی ئێستادا کە بەهۆی تازەترین سەرچاوە و تاقی کردنەوەی زانیاریەوە دانراوە تەنها (۳) دەقیقەی جیاوازە ! (هێشتا ئەوەش روون نەبۆتەوە ئایا لە راستیدا ئەمە هەڵەی ئەوانە یان ئەوکاتەی ئەو حیساباتانەی تێدا کراوە درێژی ساڵ هەر ئەوەندە بوە !)

باشە، ئەم حیسابە وردانە ئەبێ کێ کردبنی و کەی کرابن؟

ئێمە هەتا ئێستا دەربارەی ئەمە هیچ نازانین ! هەروەها ئەوەش نازانین ئایا لەسەر چی سەرچاوەیەکەوە زانای ئەسترۆنۆمی یۆنانی ((گیپارک)) – کە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر ژیاوە – ئەو زانیاریانەی دەربارەی مەداری مانگ وەرگرتوە کە تەنها (۱%) ی پلەیەک لەوەی ئێستا زانراوە جیاوازە !

ئـەتوانین بــە دڵنیاییــەوە بڵــێ یــن کــە بنچینــەی ئــەم زانیاریانــە ئەگەڕێتەوە بۆ کاتی زۆر لەمە کۆنتر. شتێکی تر، لەسـەر یـەکێک لـە خشتە قوڕینەکانی سۆمەر وێنەیەک دۆزراوەتـەوە کە لەگەڵ مانـگ دا دوو ئەسـتیرەی تـر پیشـان دراون. کـە ئێسـتا بـە ((ئـەلفا)) و ((گامـا)) ئەناسرێن و لە کۆمەڵە ئەستێرەی ((چەند براله)) ن [٨] بە پێ ی شوێنی پیشاندانی ئەو ئەستێرانە ئەم وێنە باسی (٦٠٠٠) ساڵ پێش ئێستایە !

وەک ((دیـۆگین)) ی لایریتـی ئـەڵێ میسـری یـەکان دەربـارەی ٣٧٣ ڕۆژگیـران و ٨٣٢ مانـگ گیرانیـان نووسـیوە. حیسـاباتی وردی ئێسـتا ئـەوە ئەسـەلمێنێ کـە تـەنها لـە مـاوەی (١٠٠٠٠) سـاڵ دا ئەوەنـدە ڕۆژگیـران و مانـگ گیـران ڕووئـەدا. هەنـدێک لـە زانـا ئەسـترۆنۆمی یەکان ئەم ماوەیە لەمـەش دوورتر ئەخەنەوە و ئـەڵێن (١٥٠٠٠) سـاڵ پ.ز. ئـەو میسـریانە دەستیان کـردوە بـە نووسـینەوەی یەکـەم مانـگ گیـران و ڕۆژگیـران. ئەمـەش ئـەمان گەینێتـەوە دەوروبـەری هـەمان مێژووی ڕوودانی لافاوەکە.

ئێسـتا، لـەکاتی بەقـەد یـەک بـوونی شـەو، و ڕۆژی بـەهاردا ڕۆژ ئەکەوێتـە کـەلووی ((نەهـەنگ)) ەوە [٩] . پـێش دووهەزارسـاڵ کـەوتبوە کەلووی ((مەڕ)) ەوە [١٠]. لەمەش زووتر لە کاتی سـۆمەری یەکاندا، لـە کـەلووی (چەنـد براڵـە)) دا بـوە. سـووڕاندنی لەسـەر خـۆی هـەموو کـەلوەکانی ئاسـمان (٢٥٩٢٠)) سـاڵ ئەخایـەنێ بـۆ تـەواو کردنـی

---

٨ - مەبەست لەوەیە کە کۆمەڵە ئەستێرەیەکی بەیەکەوە پەیدابووی لەیەک چوون . وەک لە کوردی دا ئەوتریت ((دوبراله)) لەسەر هەمان شێوە ئەم وشەیەم بەکار هێنا . وەرگێڕ

٩ - ( ٣ ) و ( ٤ ) : مەبەست لە ((برج الحوت)) و ((برج الحمل)) ە .

دەورەیەکی تەواو. سەیر ئەوەیە هەمان ژمارە لە زۆر دەستنووسی سۆمەری دا ئەبینرێ.

ئەمەی خوارەوە نموونەیەکە لەو زانیاریانەی کە نازانرێ چۆن پێش سەلماندنیان و دۆزینەوەیان لای هەندێک ئاشکرابون.

((سفیت)) ی نوسەری سەدەی هەژدەهەم، خاوەنی پەڕاوی ((گەشتەکانی ئولیڤێر))، زۆر حەزی لەزانیاری و دەستنووسی کۆن کردوە. تۆبڵێ ی لەو سەرچاوانەوە باسی ئەو دوو ((تابع)) ەی مارسی وەرنەگرتبێ، زۆر لەپێش ئەوەدا کە تەلەسکۆبی وا بەهێز دروست بکرێ سەیری ئەستێرەکانی کۆمەڵەی خۆری پێ بکرێ ؟

ئەوەی شایانی باسە تەنها پاش تێپەڕبوونی (١٥٦) ساڵ بەسەر نووسینی ئەم باسەدا زانایان ئەو دوو تابیعانەیان دۆزیەوە ! ئەوەش سەرسووڕهێنەرە کە ئەو ((سیفات)) و کاتی سووڕاندنەوەیەی ((سفیرت)) باسی کردوون زۆر نزیکن لەوەی زاناکان پێ ی گەیشتوون !!

لەسەدەی (١٦ – ١٧) دا ئەوروپا پاش پەرەسەندنێکی زانیاری دوورودرێژ گەیشتە چەند رایەکی گرنگی کوسمۆلۆجی. راستی زۆر بەگران ڕێگای خۆی کردەوە : هەتا ئەو کاتە لە گۆڕەپانی زۆر شاردا ئاگری پیاوانی ئاینی کلیەی ئەسەند بۆ سووتاندنی زانایان. (١٧) ی شوباتی (١٦٠٠) پاش هەشت ساڵ بەندی ((جۆردانۆ برونۆ)) بە زیندویەتی سووتێنرا. تاوانەکەشی تەنها ئەوە بوو کە ئەیوت ئاسمان بێ کۆتایی و بێ سنوورە و شوێنی تر هەیە کە وەک زەوی ژیانی تێدایە.

کەچی پێش ئەم زانایە بەهەزار ساڵ پتر نوسراوی هەرەمەکانی میسر و کتێبە ئاینی یەکانی هیندستان و ((تیبت)) ئەم رایەیان وەک

راستی یەکی ئاسایی نووسیوە. لەیەکێک لەنوسراوە هەرە کۆنەکانی هەرەمەکان دا (نوسراوی ژمارە ١٤٣٤ ب) باسی ئاسمانی بێ کۆتایی و بێ سنوور بەرچاو ئەکەوێ. لەپەڕاوی پیرۆزی سانسکریتی ((ڤیشنۆ - پوڕان)) دا هەربە ئاشکرا وتراوە کە ئەم زەویەی ئێمە یەکێکە لە هەزارەها ئەستێرەی لەو چەشنە کە مرۆڤیان تێدا ئەژی. لە نوسراوێکی ((تیبت)) دا نووسراوە : ((لە گەردوون دا ئەمەندە ئەستێرە هەن کە ژیانیان تێدایە هەتا ((بوودا)) ش ناتوانێ بیان ژمێرێ.)) نوسراوێکی تری ((تیبت)) ئەڵێ : ((هەریەکێک لەم ئەستێرانە چینێک هەوای شینی ئاسمانی دەوری داوە.))

وەک ((ج. ا. ماسۆن)) ی زانای ئارکیۆلۆجی ئەڵێ، ئەو باوەڕەی کە گوایا لەوانەیە لە ئەستێرە دوورەکان دا گیاندار هەبێ لە شێوەی مرۆڤ دا لە ((پیرۆ)) ی کۆنیش دا باو بوە. بەڕای ناوبراو ئەم زانیاریە لە ئەنجامی تاقی کردنەوەی رۆژانەی ئەوان دا و بە پێ ی ئاستی بەرزی رۆشنبیری ئەوسایان نەهاتۆتە گۆڕێ و زۆر لە خۆیان کۆنترە و گومان لەوەدا نیە کە سەرچاوەی ئەم زانیاریانەیان بریتی بوە لە شارستانیەتێکی دوور لەم شارستانیەتەی ئێمە.

راستییەکی تری ئێجگار کۆن لەبارەی شێوەی زەوی یەوە سەرمان سووڕ ئەهێنێ و نازانین چۆن زانراوە.

لە ١٦٣٣ دا لە خۆڵی ((سزادان)) دا دادپرسە ئاینی یەکان دەستیان کرد بە سزادانی ((گالیلۆ)) ی پیرەمێرد بەتاوانی ئەوەی کە وتوویەتی زەوی خڕە و بەدەوری رۆژدا ئەسووڕێتەوە. کاتی خۆی هەمان تاوانیش درایە پاڵ کۆلۆمبۆس و تەنها چارەنووس لە سزادان رزگاری کرد. دادگای زانکۆی ئاینی ئەوسای ((سالامان)) کە لە

پیاوانی ئاینی پێک هاتبوون سزای مردنیان ئەدا بەسەر هەرکەسێک دا بیوتایە زەویٔ خڕە.

هەمیسان بە سەرسامی یەوە ئەبینین کە ئەو زانیاریە ئەسترۆنۆمیانەی مرۆڤایەتی وا بەگران و پاش قوربانی دانی زۆر پێ یان گەیشتوە لەسەرەتای مێژووی مرۆڤایەتی یەوە لە کتێبە ئاینی یەکانی هیند و میسر و ئەمەریکادا نووسراون !!

بەڕای هەندێک زانایان، میسریە کۆنەکان زانیویانە زەوی خڕە و لە ((فەزا)) دا ئەسووڕێتەوە. خوای رۆژی میسریەکان ئەڵێ : ((تەماشاکە... زەوی وەک تۆپێکی خڕ لەبەردەممدایە)). (نوسراوی بەڕەدای لێبدینی دیمۆتۆچی).

هەروەها سووڕاندنەوەی زەوی لای میسری یەکان لە سنووری هەمان یاسادایە کە سووڕاندنەوەی ((یۆپیتەر)) و ((مارس)) و ((ساترۆن)) و ((میرکۆری)) و ((ڤینۆس)) رێک ئەخات !



رۆژ، کە ئەوروپا زۆر درەنگ گەیشتە ئەو بڕوایەی لە شوێنی خۆی وەستاوە، میسریەکان ئەیان وت لە فەزادا بە دەوری خۆی دا ئەسووڕێتەوە و لە شێوەی تۆپێکی خڕدا لە ((حوزور)) نووی خوادا، (واتا لە ناوەراستی ئاسمان دا) مەلە ئەکات. (وێنە - ١٩) ئەمە لە کاتێکدا وتراوە کە نە ئامرازی ئەسترۆنۆمی و نە تاقی کردنەوەی

زانیـاری یـان نـەبوە کـە بەهۆیانـەوە بگەنـە ئـەم ئەنجامـە. زانیـاری راستەقینەی

ئەسـترۆنۆمی لـە نوسـراوە هـەرە کۆنـەکانی ئـاینی عیسـایی شـدا ئەبینین. بۆ وێنە :

لـە بەشـی (٢٦ – ٧) ی پـەڕاوی ئیۆڤـادا نوسـراوە، کـە زەوی لـە بۆشایی دا لەسەر

((هـیچ)) وەسـتاوە. لـە پـەڕاوی ((زۆکـار)) دا ((کابـالا)) ئـەڵێ : ((هەموو ئەو

زەوی یەی لەسەرین وەک تۆپێکی خڕە و ئەسـووڕێتەوە، بەشێک لە دانیشتوانی

ئەکەونە سەرەوە و بەشێکی تری لە خوارەوەن. لە کاتێکدا کە لە دیوێکی زەوی

ڕۆژە و لە دیوەکەی تری دا شەوە. لە جێگایەک شەبەق ئەدا و لە جێگایـەکی تـری دا ڕۆژئـاوا ئـەبێ.)) دیـارە ((کابـالا)) لەسـەرچاوەی کۆنەوە ئەم زانیاریانەی وەرگرتوە.

ئـاخۆ ((ئیفلاتـون)) یـش لەهـەمان ئـەو سـەرچاوانەوە ئـەوەی وەرنـەگرتبێ کـە ئـەڵێ : ((زەوی خڕە و لـە ئـەنجامی سـووڕانەوەی دا شەو، و ڕۆژ پەیدا ئەبێ)) ؟!.

((ئاتسـی)) یـەکانیش ئاگـاداری سـووڕاندنەوەی پڵانێتـەکان بـوون. ئـەوان وێنـەی پڵانێتـەکانیان لەشـێوەی دەوری خڕ و تۆپ دا کێشـاوە کە خواکان ((یاری)) یان پێ ئەکەن !

بۆیـە هـیچ سـەیر نیـە کـە دۆزینـەوەی ئەسـترۆنۆمی لەوەپاشـی ئەوروپا هەرلە ئاسمان دا نەئەکرا و بۆی نەئەگەڕان، بەڵکو زیاتر لە

دووتــویّ ی دەستنووســە کۆنــەکان دا بــۆی ئەگــەڕان. بــەم جــۆرە ((کۆپــەرنیکۆس))، کەبــە داهێنــەری بیــروڕای ســووڕاندنەوەی زەوی بــەدەوری رۆژدا ئــەژمێردریّ، لــەو پێشــەکیەدا کــە بــۆ کتێبــەکانی نووسیوە و بــەرەورووی پاپای رۆمـای کردۆتـەوە ئـەڵێ کـە باسـی سووڕاندنەوەی زەوی لە پەڕاوە کۆنەکانەوە وەرگرتوە. لەوانـەیە ئـەو پەڕاوانـە هـەمان ئـەو سـەرچاوانە بـن کـە بەئێمـە نەگەیشـتوون و ((ا. شیراکاشی)) زانـای ئەرمـەنی سـەدەی حەوتـەم خوێندوونیەتەوە. ئـەو زانایـە شـێوەی زەوی بـە هێلکـەیی دانـاوە و ئـەڵێ کـە ((زەردێنـە)) ی هێلکەکـە زەوی خۆیــەتی و ((سپێنەکەشــی)) ئــەو ئاتمەســفێرەیە کــە دەوری داوە !

وەک دەرئەکەویّ، زانیـاری دەربـارەی خـڕی زەوی و ئەسـتێرەکان لــە شارســتانیەتێکی کۆنــەوە ماونەتــەوە و فێــری نــەوەکانی دوارۆژ کــراون و لــە دوایــی دا دووبــارە ون بوونەتــەوە. ون بــوون و لــە ناوچوونیشیان شتێکی ئاسایی یە و هەر ئەبوایە وابوایە چونکە زیـاد لــە پێویســت لــە ســنووری ژیریــی و ئاســتی توانــای زانینــی ئــەو سەردەمەی مرۆڤایەتی بەرزتر بوون و ((ئەقڵیان)) وەریان نەگرتوە !!

ئەم نموونەیەی خوارەوە بەڵگەیە بۆ ئەمە :

((تەنها لەسەدەی بیستهەم دا مرۆڤایـەتی بـەهۆی تـاقی کردنـەوە و رەحمـەتی یـەکی بـیّ سـنوور و بـەهۆی زانیـاری فەلسـەفی و تیـۆری یـەوە گەشـتە ئـەوەی کـە بڵـیّ ((مـادە – شـتێکی کۆتـایی نـەهاتوە و نەمرە.)) لەکاتێک دا کە ئەم بیروڕایـە زۆر لـەپێش عیسـادا وتـراوە. بـۆ وێنە، ((دیۆدۆر)) ی صقللی نووسیویەتی کە ((خـالد)) یـەکان بـاوەڕیـان

وابوه ئەو مادەیەی گەردوونی لێ پێک هاتوە نەمرە و لەبەر ئەوەی هەبوە و دروست نەکراوە هەر ئەمێنێ و لەناو ناچێ.)) !

هەربەم جۆرە، لەپڕ هەندێک زانیاری کۆسمۆلۆجی گەلانی کۆن بەشێوەیەک دەرئەکەوێ کە لە سنووری روون کردنەوەدا نیە، مەبەستمان لە شێوەی زەوی یە پێش پەیدابوونی ((ژیان)) لەسەری. ((سلاڤی)) ی بت پەرەستەکان لایان وابوە کە کاتی خۆی زەوی هەموو ئاو بوە و لەوە پاش وشکانی لەئاوەکە ((دەرپەڕیوە)). هەمان بیروڕا دەربارەی ئەو ئاوەی لەسەرەتاوە هەموو زەوی داپۆشیوە لەناو گەلانی سیبیریاش دا بڵاو بوە !

((ریگڤیدا)) ی هیندیش ئەڵێ : ((جیهان لەو ئاوە بێ سنوورە پەیدا بوە کە هەموو گەردوونی داپۆشیوە.))

دەستنووسە چینی یەکانیش ئەیسەلمێنن کە لەسەرەتاوە هەموو رووی زەوی بە ئاو داپۆشراوە.

هەموو نوسراوە میسری یەکانیش، کە لەم بارەیەوە ئەدوێن، ئەڵێن : ((لەسەرەتادا هەموو زەوی بەئاو داپۆشراوە و لە ئاوەوە ژیان پەیدا بوە.))

ئەی ئینجیل لەم روەوە ئەڵێ چی ؟

ئەویش ئەڵێ کە پێش پەیدابوونی ژیان لەسەر زەوی هەموو بەئاو داپۆشرابوو. لەپاشدا ئەڵێ : ((خوا وتی، دەبا وشکانی لەناو ئاوەکەدا پەیدا ببێ.))

بیروڕای هیندی یە سوورەکانی هەردوو ئەمەریکاش هەروایە. لەپەڕاوی پیرۆزی ((پۆپۆل – ڤۆخ)) دا نووسراوە : ((نە مرۆڤ هەبوو، نە گیان لەبەر، نە باڵدار، نە ماسی، نە قرژاڵ، نە دار، نە

ئەشکەوت، نە دۆڵ، نە گیا و نە دارستان – ئەمانە هیچیان نەبوون و تەنها ئاسمان هەبوو. ئەو کاتە هێشتا رووی زەوی دەرنەکەوتبوو، و تەنها زەریایەکی سارد و ئاسمانێکی قراوان هەبوو.))

دەربارەی سەرەتای زەوی سۆمەری یەکان و ئاشووری یەکان و ((مای)) و خەڵکی پۆلۆنیزیا و ((کیت)) ەکان و گەلانی ((پیرۆ)) ش هەمان بیروڕایان هەبوە. زۆر گرانە بڕوا بەوە بکەین کە لەم هەموو شوێنە جیاجیا و لەیەک دوورانەی سەر زەوی دا بەجارێک گەیشتبنە ئەم زانیاریە کۆسمۆلۆجی یە لە یەک چوانە. زیاتر بەوە بڕوا ئەکرێ کە ئەمانە هەموویان، هەروەها بە نیسبەت زانیاری یەکانی تریشەوە، لەیەک سەرچاوە وەرگیرابن !

هەروەها بێجگە لەو شتانەی باسمان کردن، لەیەک نزیکی شێوەی رۆژ ژمێری گەلانی جیاجیاش بەڵگەیەکی سەرەکی یە بۆ ئەم ڕایە.

لە رۆژهەلاتی نزیک و میسری کۆن و هیندستان، ساڵ کرابوو لە (١٢) مانگەوە. ئەی بۆچی لەودیو رووی زەویش، واتا لە ئەتڵەنتیک و ئەمەریکای خواروو، بەهەمان شێوە ساڵ دابەش کراوە ؟

لەمەش وردتر و تێکڕایی تر : ساڵ لای ((مای))یەکان بریتی بوو لە (٣٦٠) رۆژ، پێنج رۆژی تریشیان دانابوو کە ناویان نابوون ((پێنج رۆژەی بەدبەختی، یان بێ ناو)).

لەماوەی ئەم پێنج رۆژەدا گوێ نەئەدرایە یاسا و نەریت، ئەتوانرا قەرز نەدرێتەوە و فێڵ بکرێت و هتد.. هەمان شێوە لە میسری کۆن و بابل و لەوەش دورتر – لە هیندستانیش دا هەبوە !

بێجگە لەمەش، لە ئەورووپا و لە پیرۆی کۆن دا ساڵی تازە لەیەک کات دا دەستی پێ ئەکرد : لەمانگی ئەیلول دا.

لەم پەڕو ئەوبەوپەڕی جیهان دا نوسراو، و ئەفسانە ئاینی یەکان ئەیسەلمێنن کە تەمەنی ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر زەوی کراوە بە چوار بەشەوە، (ئەم کاتەی ئێمە دوابەشیەتی) و بۆ هەر بەشێکی، بەم جۆرەی خوارەوە، لەلایەن گەلانی جیاجیاوە رەنگێک دانراوە :

| ناوی گەل | بەشەکان و رەنگەکان | | | |
|---|---|---|---|---|
| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ |
| ١ – یۆنانی کۆن | زەرد | سپی | سوور | رەش |
| ٢ – کیلتیەکان | سپی | سوور | زەرد | رەش |
| ٣ – هیندوسەکان | سپی | زەرد | سوور | رەش |
| ٤ – (مای) یەکان | سپی | زەرد | سوور | رەش |

ئەوەی شایانی باسە، ئەتوانین بەداخەوە بڕوانینە ئەم یەکیەتیە سەیرەی کە لەناو گەلانی جیاجیای سەرزەوی دا هەبوە لەبارەی دوابەشی تەمەنی مرۆڤایەتی یەوە. ئێستا ئێمە لەم دوابەشە ((رەش)) ەدا ئەژین !

لەیەک چوونی بیروڕا دەربارەی زمانی گەلان ئەمان گەیەنێتە هەمان ئەنجامی سەرسوڕهێنەر. لەم بارەیەوە ئینجیل ئەڵێ : ((لەسەر زەوی تەنها یەک زمان و یەک زاراوە هەبوو. ئەو گەلەی لە رۆژهەلاتەوە هاتن و لە ((سینار)) دا دەشتێکی فراوانیان دۆزیەوە لێ ی نیشتەجێ بوون.. وتیان با دوو بورجی وا دروست بکەین سەریان بگاتە ئاسمان. خوا ووتی : وا ئەمانە یەک گەلن و یەک زمانیان هەیە، دەستیان کردوە بەم کارەیان و لێ ی پاشگەز نابنەوە.. با زمانەکەیان

وا تێکەڵاو بکەین کە یەک لە یەک نەگەن، لەبەر ئەوە ئەم شارە ناونرا ((بابل))، چونکە خوا لەوێ زمانی هەموو سەر زەوی تێکەڵ کرد و لەوێوە بەهەموو لایەکدا بڵاوی کردنەوە....))

مێژوونووس و زانای ئاینی بابلی ((بیرۆز))، کە زۆر لە ئینجیل کۆنترە، بەم جۆرە لەم باسە ئەدوێ : ((ئەگێڕنەوە کە مرۆڤ گەیشتە پایەیەکی هێندە بەرز و زیرەکی گاڵتەیان بە خواکان ئەهات و خۆیان لەوان بەرزتر ئەزانی. لەو شوێنەی ئێستا پێ ی ئەڵێن بابل بورجێکی ئەوەندە بەرزیان دروست کرد خەریک بوو بگاتە ئاسمان. ئەوسا با یارمەتی خوای دا و ئەو بورجەی بەسەر دروست کەرەکانی دا روخاند و ئەو کەلاوانەش ناوی ((بابل)) ی لێ نرا. پێش ئەمە خەڵک بە یەک زمان ئەدوان، بەڵام خوا پاش ئەمە زمانی لەیەک جیاکردنەوە و بە زمانی جیاجیا دوان.))

بەم جۆرەی خوارەوە ئەفسانەیەکی گەلی ((تۆلتیسک)) ی مەکسیکی ئەم باسە روون ئەکاتەوە : ((کە چەند کەسێک لە لافاوەکە رزگاریان بوو، و نەوەیان خستەوە و پەرەیان سەند، دەستیان کرد بە دروست کردنی بورجێکی بەرز.. بەڵام لەپڕ زمانەکەیان تێکەڵ و پێکەڵ بوو، و نەیان توانی لەیەکتری بگەن بۆیە ناچاربوون بەهەر چوار لای زەوی دا بڵاو بوونەوە.))

لەم جۆرە ئەفسانانە لای زۆربەی گەلانی تری ئەمەریکا باون، سەیر ئەوەیە کە هەموویان لەناونان، و شێوەی ئەو بورجەدا یەک ئەگرنەوە : جوولەکە پێ ی ئەڵێ ((با – بیل)) (هەر ئەم ناوەشی بەسەردا دابڕاوە و جێ ی خۆی گرتوە) کە واتای ((دەرگای خوا))

ئەگرێتەوە. لەهەندێک ئەفسانەی ئەمەریکاش دا هەریەکسەر بە ((دەرگای خوا)) ناوئەبرێ.

بەڵگەی یەک زمانی هەموو گەلانی سەرزەوی هەر تەنها لە پەڕاوە پیرۆزەکانی رۆژهەلاتی نزیک و ئەمەریکادا نیە، هەمان هەواڵ لەنوسراوی ((بوودی)) و میسری کۆنیش دا بەدی ئەکرێ.

لێرەدا ئەوە گرنگ نیە کە ئایا ئەمە راستە یان نەء، چونکە بە پێ ی ئاستی زانیاری ئێستا هێشتا بەڵگەی وامان بەدەستەوە نیە ئەمە بسەلمێنی یان رەتی بکاتەوە. (هەرچەندە بۆ بەڵگەی یەک زمانی گەلان تیۆری ((ن. یا. مارِ)) لە گۆڕێ دایە) بەلام بەلام ئەوەمان لا گرنگە کە لەهەموو لایەک دا ئەم باسە ((هاوبەش)) ە. گومان لەوەدا نیە کە ئەم هەموو لەیەک چوونە ناشێ ((بەرێکەوت))بێ.

زانای بەناوبانگی ئەڵمانی ((ا. هامبولت)) لەم بارەیەوە نووسی : ((بەدڵنیاییەوە ئەڵێم لەیەک چوونی ئەفسانەی گەلانی ئەمەریکا و گەلانی رۆژهەلاتی ئاسیا لەبەر ئەوە نیە کە لەهەر یەکێک لەم جێگایانەدا گەیشتوونەتە ئەنجامێکی لەیەک چوو، بەڵکو بەهۆی بوونی پەیوەندی یەکی نزیکی کۆنەوەیە لە نێوانیان دا.

بەڵگەی بوونی پەیوەندی لە نێوان گەلانی زۆر لەیەک دوور لە کۆن دا هەتا دێت پتر دەرئەکەوێ. ئەم پەیوەندی یە لە خوارووی رۆژهەلاتی ئاسیاوە بەناو ئۆقیانووسی ((هێمن)) دا ئەکشێ هەتا رۆخەکانی ئەمەریکا، لە رۆخەکانی ئەوروپاوە بەرەو ((یۆکاتان))، لە هیندستانەوە بەرەو ئەمەریکای خواروو و ئەمەریکای سەروو، هەر ئەم پەیوەندی یەشە کە بۆتە هۆی لەیەک چوونی ئەو زانیاری یە

بەرزانەی باسیان لەناو ئەو گەلانەدا هەیە کە بە دەهەزارەها کیلۆمەتر لە یەک دوورن.

چەند زانیاری پێش بکەوێ ئەوەندە زیاتر لە بیرورای بوونی شارستانیەتیکی تر نزیک ئەبینەوە. لەم بارەیەوە زانایەک ئەڵێ : ((زانیاری ئارکیۆلۆجی و ئیتنۆگرافی ئەم نیو سەدەیەی دواییە سەلماندوویانە کە شارستانیەتە کۆنەکانی ئەمەریکا و میسر، میسۆپۆتامیا و کریت و یۆنان، هیند و چین، یەک سەرەتا و یەک بنچینەیان هەیە، بەڵگەش بۆ ئەمە لەیەک چوونی سەیری ناوەڕۆکی چیرۆک و ئەفسانە کۆنەکانیانە.))

**<u>٢ – بەڵگەی جوغرافی :</u>**

زانایان ووردی و راستی و لەیەک چوونی زۆر نەخشەی هات وچۆی زەریایی سەدەکانی ناوەڕاست ئەگێرنەوە بۆ ئەوەی کە



هەموو ئەو نەخشانە ((روونووس)) ی ئەو نەخشە ئەسڵیە کۆنانەن کە بە ئێمە نەگەیشتوون. لەهەندێک لەم نەخشانەدا زەوی و کیشوەری وایان لەسەر نیشانە کراوە کە ئەوسا هێشتا دەربارەیان هیچ نەزانراوە و پاش چەند ساڵێک دۆزراونەتەوە.

نووسەرانی ئەو نەخشانە خۆشیان پێ یان لەوەناوە کە لە نموونەی ناو کتێبخانەکەی ئەسکەندەریەیان وەرگرتووە کە گەڕاونەتەوە بۆ کاتی ئەسکەندەری مەکدۆنی. بەم جۆرە، نەخشەکەی حاجی ئەحمەدی تورکی، کەلەساڵی ١٥٥٩ دا کێشاویەتی – واتا دوو سەدە پێش دۆزینەوەی ئەمەریکا – بە ئاشکرا ڕۆخی ئەمەریکای ژووروو، و ئەمەریکای خوارووی لەسەر دیاری کراوە. (وێنە ٢٠).

بە بیروڕای زانایانی سۆڤێتی ((ل. گومیلێڤا)) و ((ب. کوزنیستوڤ)) هەواڵی ئەمەریکا لە نوسراوە ((تیبت)) یەکانی هەزار و پێنج سەد ساڵ پ.ز. دا هەیە.





نەخشەیەکی ((ئەنتراکتید)) مان لایە کە لەساڵی (١٦٣٢) دا لە لایەن ((فرۆنتی فیناوس)) ەوە ئامادە کراوە بە لایەنی کەمەوە دووخاڵی لەسەرە کە نەزانراوە :

**یەکەم :** سنووری وشکانی لەسەر ئەو نەخشەیە (وێنە ٢١) زۆر لەوە نزیکە کە ئێستا هەیە (وێنە ٢٢) بۆ ئەمەش هیچ روون

کردنەوەیەکمان نیە، چونکە ئاشکرایە کە تەنها لەسەدەی نۆزدەهەم دا مرۆڤ بەرەو ئەنتراکتید چوە و نەخشەی بۆ کێشاوە.

**دوهەم :** کە ئەم نەخشەیە لەگەڵ نەخشەی ئێستادا بەراورد ئەکەین ئەبینین لەوەدا هەندێک رووبار و گۆم نیشان دراون بەلاّم لە راستیدا ئێستا هیچ رووبارێک لەو ناوچەیەدا نیە، بەڵکو لەو شوێنانەی لەو نەخشەیەدا وەک رووبار پیشان دراون ئێستا ((تاشە سەهۆڵ)) وردە وردە بەرەو ئۆقیانووس ئەجووڵێت و تێکەڵی ئەبێت. ئەمەش ئەمان گەیەنێتەوە ئەوەی بڵێ ین ئەم نەخشەیە بنچینەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی شوێنی ئەم ((تاشە سەهۆل)) انە رووبار بوون، واتا بۆ چوار هەزار ساڵ پێ.ز. کە سەهۆڵ هەموو سەر رووی ئەنتراکتیدی داپۆشی.

بەڵگەیەکی ترمان بەدەستەوەیە ئەویش نەخشەی ئەورووپاکەی ((پتۆلۆمێ ی)) یە کە بە چەند پەڵەیەکی سپی داپۆشراوە. ئێستا پاش لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژ دەرکەوتوە کە سنووری دوا ((سەهۆڵ بەندان)) ی ئەورووپا لەگەڵ سنووری ئەو پەلاّنەدا یەکن. ئەگەر ئەمە وابێ، کەواتە بنچینەی ئەو نەخشەیەی ((پتۆلۆمێ ی)) ئەگەڕێتەوە بۆ (٨٠٠٠) ساڵ پێ.ز.

## ٣ – بەڵگەی ماتیماتیکی

یەکێک لەو بەڵگانەی ئەگەڕێنەوە بۆ مێژووی زۆر کۆن، بەرزی ئاستی زانینی گەلانە لەم بەشەی زانیاریەدا کە نازانین چۆنی گەیشتوونێ. بۆ وێنە : زاراوەی ((ملیۆن)) لە ئەورووپادا تەنها

لەسەدەی نۆزدەهەم دا پەیدا بوە، کەچی میسری یە کۆنەکان ئەمەیان زانیوە و نیشانەشیان بۆ داناوە.

لە ماتیماتیکدا ژمارەی ((پای π)) بە ژمارەی ((لۆدۆلف)) ی زانای هۆڵەندی سەدەی حەڤدەهەم ناسراوە کە ڕێژەی درێژی هێڵی دەوری بازنەی بۆ درێژی تیرەکەی دەرئەخات. بەڵام لە مۆزەخانەی هونەریی ((پوشکین))، لە موسکۆ، نوسراوێکی سەر بەڕەدای میسری کۆن دەری ئەخات کە لە زۆر دەمێکەوە ئەم ژمارەیە لای ئەوان زانراوە.

پێش میسری یەکان ئەم ژمارەیە لای سۆمەری یەکانیش ئاشکرا بوە. هەروەها ئەو تیۆری یەشیان زانیوە کە هەزار ساڵ لەوەپاش ((فیتاغۆرس)) دۆزیەوە. زانایانی ئاینی و ((پاریزەرانی)) پەڕاوە پیرۆزەکانی ((سۆمەر)) پرسیاری ئاوێتەی جەبری و ((هاوکێشەی دووجای چەند نەزانراو)) و بگرە پرسیاری واشیان شی کردۆتەوە کە لەسنووری ((جەبر)) دەرچوون ! ئەوەی شایانی باسە زانایان لەکاتێکی وا دڕندە و نەزانی دا خەریکی ئەم باسە گرانانە بوون کە دەور و پشتیان هیچی لێ تێ نەئەگەیشتن و بە مێشکیان دا نەئەچوو. ئەو زانیاریانەی بە ((چیلکە)) لەسەر قوڕ ئەیان نووسی زۆر لە سنووری زانین و ژیانی ئەو سەردەمەیان دەرچووبوو. هەمیسان ئەو زانیاریە بەرزانەمان دێتە پێش کە مرۆڤایەتی تەنها هەزار ساڵ پاش ئەوان دووبارە پێ یان گەیشتەوە. بۆ نموونە، سۆمەری یەکان ((متوالیەی ژمارەیی)) وایان بەکار هێناوە گەیشتۆنەتە (١٩٥٩٥٥٢٠٠٠٠٠٠٠٠) ! ئەوەی شایانی باسە، لەکاتی ((دیکارت)) دا ئەوروپا هێشتا نەگەیشتبوە ئەم ژمارەیە.

## ٤ – بەڵگەی میتالۆرگیا :[11]

باسی ئەو ((رابەر)) انەمان کرد کە زانیاری یان گەیاندە هەر چوار لای جیهان. تۆ بڵێ ی کلیلی ئەم مەتەڵە ((سەدەی برۆنز)) ی ئەوروپا نەبێ ؟ وەک ئاشکرایە برۆنز بریتیە لە تواندنەوە و تێکەڵاو کردنی مس و قەڵایی. دیارە پێش پەیدا بوونی برۆنز ئەبێ مس و قەڵایی بە جیاجیا زانرابن و بەکار هێنرابن. دیارە هەزارەها ساڵ مس بەکار هێنراوە ئەوسا گەیشتوونەتە ئەوەی بزانن ئەگەر ١% ی مسەکە قەڵایی تێکەڵ بکەن میتاڵێکی پتەوی بەهێزی سەرسوڕهێنەر دروست ئەبێ.

لای هەموان ئاشکرایە کە لە ئەوروپادا سەدەی ((مس)) ی نەبوە و بەدەگمەن شتی لە مس دروست کراو بەرچاو ئەکەوێ، کەچی کەل وپەلی لە برۆنز دروست کراو لەپڕ لە ئەوروپادا پەیدا بوو، و بڵاو بوەوە. زانایان ئەوەیان بۆ دەرکەوتوە کە یەکەم کەل و پەلی لە مس دروست کراو زۆر بە وردی و وەستایانە ئامادە کراوە کە ئەوە ئەگەیەنێ ئەو خەڵکە وردە وردە لە ئەنجامی تاقی کردنەوەدا فێری نەبوون بەڵکو یەکسەر بە شێوەیەکی پێشکەوتوانە و بێ پێشەکی فێری بوون.

بەڕای شارەزای ناوداری کولتوری ئەمەریکا ((پۆل ریڤ)) بەهەمان شێوە لەسەر خاکی مەکسیکیش هونەری برۆنز لە پڕ پەیدا بوە و کەرەستەی وا گرنگ و وردی لێ دروست کراوە گەیشتوونەتە

١١ – میتالۆرگیا : metallum مەعدەن + ergon کار : وشەیەکی یۆنانی یە . زانیاری دەرهێنانی مەعدەن و تواندنەوە و بەکارهێنانی . وەرگێڕ

لوتکەی بەرزی هونەری. هەروەها هیچ نیشانەیەکیش دیار نیە کە ورده ورده ئەم میتاڵ سازیە لەویٚ پەیدا بووبیٚ.

مێژووی ئاسنگەریش هەربەم جۆرە. ئاشکرایە کەماوەی نێوان دەرکەوتنی ئاسن بۆ یەکەم جار و دارشتنی لەشێوەی پێویست دا ((٢ – ٥ ر ٢)) هەزار ساڵی خایاندوە، کەچی لەخوارووی رۆژهەلاتی ئاسیادا هەروەک لە ئاسمانەوە هاتبیٚ لەپڕ ئەم پیشەیە دەرئەکەویٚ.

ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنیٚ کە مرۆڤ هەموو کاتیٚ بە کۆششی خۆی فێری میتاڵ تواندنەوە نەبوە، بەڵکو بە ئامادەیی ئەو زانیاری یە هاتۆتە بەردەمی ؟ هەندێک راستی تریش هەیە ئەمە ئەسەلمێنیٚ. شێوەی ئەو ئامراز و کەرەستە برۆنزیانەی لە جێگا جیاجیاکانی ئەوروپا دۆزراونەتەوە ئەوەندە لەیەک ئەچن کە هەندێک لە زانایان رایان وایە هەموویان لەیەک جێگا دروست کراون.

بەڵگەیەکی تر بۆ سەلماندنی هاتنی هونەری برۆنزکاری لە ((لایەکی ترەوە)) ئەوەیە کە میسر و میسۆپۆتامیا، کەبە رابەری هونەری برۆنزکاری ئەژمێردرێن، خۆیان مادەی ((خاو)) یان نەبوە و کاروانیان ناردووە بۆ ولاتانی تر بۆ هێنانی مادەی خاو. بۆ وێنە : بۆ هێنانی قەلایی ئەچوونە قەفقاس یان نیمچە دۆرگەی ((پیرێن)). هەروەها بۆ ولاتی لەمەش دوورتر ئەچوون، وەک دۆرگەکانی بەریتانیا کە ئەوەندە لە قەلایی دا دەوڵەمەند بوون فینیقیەکان ناویان نابوون ((دۆرگەی قەلایی)).

دوور نیە هونەری برۆنزکاری یەکێک بێت لەو زانیاریانەی کە لە لافاوەکە رزگار کراون و ماوەیەکی زۆر نهێنی یەکانی تەنها لای کاربەدەستە ئاینیەکان زانرابن !، هەر لەبەر ئەمەشە کە لە زۆربەی

ناوچـەکانی ئـەوروپادا هونـەری برۆنزکـاری و ئاسـنگەری بـە کـاری ((زانیاری نهێنی)) و ((جادووگەری)) دائەنرا. بۆ وێنە، گەلـە سـلاڤی یـە کۆنەکان ئاسنگەریان بە ((جادووگەر)) یَک دائەنا کە زانینی ((کۆن)) فێر بوە.

زانای ئارکیۆلۆجی ناودار ((ج. ا. ماسۆن)) لە گۆڕێکی ((پیرۆ)) دا خشڵێکی پلاتینی دۆزیەوە. ئاشکرایە کە پلاتین لـە پلـەی (١٧٣٠) ی گـەرمایی دا ئەتوێتـەوە. بۆ ئـەم کـارەش تیکنیکـای پێشـکەوتووی ئـەم سەردەمەی ئێمە پێویستە.

هەتا ئێستا سـەرەتای بـەکارهێنانی کارەبا بـە سـاڵی ١٧٨٦ دائەنرا کە ((لۆیجی هالفانی)) تـاقی کردنەوە ناودارەکانی خۆی کرد. زانایـان لـــە رۆخـــی دەریـــای دیجلـــەدا پارچـــە ســـواڵەتێکی بریقـــەداری دە سانیتیمەتری یان دۆزیەوە کە ((تەل)) ئاسن و ((لوولە)) ی مسـی پێدا راکێشـــرابوو و بـــەهۆی جـۆرە ((ترشـــەڵۆک)) یَکـــەوە لەیـــەک دوور خرابوونـــەوە ! زانایـان بڕوایـان وایـە کـە ئەمـە شـتێکە لـە چەشـنی ((توخمەکانی هالفانی)).

سـەیر ئەوەیـە پـاش تـاقی کردنەوەیـەکی ورد و گێڕانـەوەی ئـەو توخمە بۆ دۆخی سەرەتایی خۆی ((تەیار)) ی کارەبایی پەیدا کرد !!

تۆ بڵێی ی ئەمە بنچینەی نهێنی ((زەرەنگەریی)) سۆمەری یـەکان نـەبێ کـە ئـەیان تـوانی بـەزێڕ زاخـاوی تـەنکی کەرەسـتەی لـە زیـو دروسـت کـراو بدەنـەوە و شـێوەی زێڕی بـدەنێ ؟ ئەگـەر ئەمـە وابێ کەواتـــە لەســـەرەتایەکی دووری ژیـــانی مرۆڤایـــەتی دا ((کارەبـــا)) بەکارهێنراوە !! هەتا ئێستا لـەم روون کردنەوەیە پترمـان بەدەسـتەوە نیە بۆ ئەو هونەرە بەرزەی سۆمەری یـەکان هـەیان بوە ! ئەگـەر ئـەم رایە دوێنێ بەشێکی سەیر و باوەڕ پێ نەکراو بزانرایە ئەمڕۆ بەڵگەی

ئارکیۆلۆجیمان بەدەستەوەیە بۆ سەلماندنی، و ئەتوانین ئەو هەوالانە تێ بگەین کەهەتا ماوەیەکی کەم لەمەوپێش روون کردنەوەیانمان نەئەزانی.

کە بەهۆی ((تیشک))ەوە زانایان لەنەخشەکانی سەرگۆڕی سەرکردەی سەربازیی بەناوبانگی چینی چۆزو - چۆزو (٢٦٥ - ٣١٦ ز) وردبوونەوە ئەنجامێکی ئەوەندە سەیریان بۆ دەرکەوت کە بڕوایان بە خۆیان نەکرد و چەند جار تاقی کردنەوەکانیان دووبارە کردەوە. لە ئەنجام دا بۆیان دەرکەوت ئەو نەخشانە لە مەعدەنی دارێژراو پێک هاتوە کە ٥% ی مەغنسیۆم و ١٠% مس و ٨٥% ی ئەلەمنیۆمە ! ئەمەی دوایی یان شتێکی هەر زۆر سەیر و بڕوا پێ نەکراو بوو.

ئاشکرایە کە یەکەم جار ئەلەمنیۆم لەساڵی ١٨٠٨ دا بە هۆی ئەلەکترولیزەوە [١٢] دەرهێنراوە. هەتا ئێستاش ئەلەکترولیز تاکە ڕێگایە بۆ دەرهێنانی ئەلەمنیۆم. ئێمە لێرەدا ئەبێ بەیەکێک لەم دوو شتەی خوارەوە بڕوا بکەین:

یان پێش زیاد لە (١٦٠٠) ساڵ بێجگە لە ئەلەکترولیز ڕێگایەکی تر هەبوە بۆ دەرهێنانی ئەلەمنیۆم کە ئێمە هیچی لێ نازانین و ماوەیەکی زۆرە زانایان بێ ئەنجام هەوڵی دۆزینەوەی ئەدەن، یان کۆمەڵە مرۆڤێکی کەم ئەلەکترولیزیان زانیوە !! دۆزینەوەی ((توخمەکانی هالفانی))، کە باسمان کرد، لە سۆمەردا ئەم رایەی دواییەیان پتر ئەسەلمێنێ.

---

١٢ - ئەلەکترۆلیز : زانیاری دارشتن و تواندنەوەی چەند میتاڵێک بەیەکەوە بە هۆی بردنی هێزی کارەباوە بەناو مەحلوولی کیمیاوی خوێ و ترشەڵۆک دا . وەرگێر

**٥ – بەڵگەی پزشکی**

دەرمـانی کوتـانی ئاوڵـە لەلایـەن ئـەوروپایی یەکانـەوە تـەنها لـە کۆتـایی سـەدەی هەژدەهـەم و سـەرەتای سـەدەی نۆزدەهـەم دا دۆزرایـەوە، بـەڵام مرۆڤایـەتی کـۆن ئەمـەی بـاش زانیـوە. کتێبـی ((سـاکتابیا هانتخـام)) – کـە یەکێکـە لـە هـەرە کـۆنترین پـەڕاوە سانسـیکریتیەکان– کۆتـانی ئاوڵـە بـەم جـۆرەی خـوارەوە ئەنووسـێ: ((کەمێک لەکێمی ئاوڵە بخەرە سەر نووکی چەقۆیەک و بیکە بە قۆڵی ئەو کەسـەدا.. با لەگەڵ خوێنەکەی دا تێکەڵاو بێت.. پاش ئەمە لـەرز وتـا ئـەیگرێت و نەخۆشـیەکەی زۆر بـەلاوازی تـووش دێـت و لـێ ئەبێتەوە بێ ئەوەی ئازاری بدات و مەترسی هەبێ.)) !

زۆر نهێنـی پزشـکی لـە کۆنـەوە لـە نوسـراوە ((جادووگـەری)) و ((ئـەلکیمیا)) [١٣] و ئەفسـانەی ئـەو گەلانـەدا هـەن کـە بـە ((خێڵـە دواکەوتوەکان)) نـاو ئـەبرێن هـەتا ئێسـتاش زانیـاری پزشـکی توانـای بەسەریان دا ناشکێ و بۆی روون نەبۆتەوە.

رۆژنامـەی ((ڤیچێرنـەیا مەسـکڤا)) [١٤] ١٧ ی تـەموزی ١٩٦٣ ئـەم هەواڵـە کورتـەی بڵاو کـردەوە : ((لەماڵێکدا سـەگ و پشیلەیەک زۆر دۆسـتانە بەیەکـەوە ئـەژیان، پشـیلەکە زا و بەچکەیـەکی بـوو، بـەڵام دایکەکـە مـرد. ئەوسـا سـەگەکە دەسـتی کـرد بـە بەخێوکردنی بەچکـە

١٣ – ئەلکیمیا : alehemia وشەیەکی یۆنانی یە : ئەو کارەی لەسـەدەکانی ناوەڕاست دا بەکار هێنرا بە نیازی گۆڕینی مەعدەنی کەم نرخ بۆ زێڕ و مەعدەنی بەنرخ . وەرگێڕ

١٤ – مۆسکۆی ئێواران .

پشیله چاونەپشکوتوەکە و وەک دایکی بەدەوری دا ئەهات. زۆری پێ نەچوو سەگەکە مەمکی شیری پەیدا کرد و بەمە بەچکە پشیلەکەی پێگەیاند. هەتا ئێستاش زانیاری لەبەردەم ئەم رووداوەدا کۆڵە و هۆیەکەی نازانێ.))

سەیر ئەوەیە لە رابوردوودا ئەمە شتێکی ئاسایی بوە. زانا ئێتنۆگرافی یەکان ئەم هەواڵە ئەگێڕنەوە : ((لەناو خێڵەکانی ئێرۆکیز و ئەسکیمۆ و ماوری یەکانی نیوزیلانددادا کە منداڵێک لەدایک ئەبێ دایکی و ئافرەتە گەنجەکان شیری نادەنێ، بەڵکو ئەیدەنە دەست پیرترین ژنی ئەو خێڵە. ((حەکیم)) ی ئەو تیرەیە دەرمانێکی بۆ ئەگرێتەوە و پاش بەکارهێنانی لەپڕ مەمکی ئەو پیرەژنە پڕ ئەبێ لەشیر !))

نموونەیەکی تر، ئاشکرایە لەئەنجامی خورپەیەکی گەورە یان ((لەرزین))ێکی بەهێزی مێشک یان بەهۆی نەخۆشی یەوە مرۆڤ لەوانەیە بگاتە دۆخێک هیچی لەبیر نەمێنێ. ئەو مرۆڤە نەناوی خۆی ئەزانێ و نەخزمانی ئەناسێتەوە و نە رابوردووی لەبیرە، پزیشکی هەتا ئێستا خەریکی لێکۆڵینەوە و دۆزینەوەی چارێکی ئەم نەخۆشی یەیە، کە چس وەک لەزۆر سەرچاوەدا ئاشکرایە ئەمە لەزۆر کۆنەوە زانراوە. مەبەستمان لە ((شەربەتی لەبیر چوونەوە)) یە کە شارەزایانی ئەلکیمیا ئەیان دا بەهەر کەسێک یەکسەر هەموو شتێکی بیرئەچوەوە. بەداخەوە ((رەچەتە)) ی ئەو شەربەتە لەسەدەکانی ناوەراست دا ون بوو، و لەناوچوو.

## ٦ – بەڵگەی ((خانوبەرە)) دروست کردن

زۆر بینا و دروست کراوی کۆنی واهەیە کە بنیات نانیان پێویستی بە زانیاریەکی پێشکەوتووی ئەندازیاری و هونەری وا کردوە ئێستا وێنەیان کەمە.

لەوەپێش باسی شاری ((تیاناکو)) ی سەرشاخی ((ئاند)) مان کرد. خانوبەرەکانی لەبەردی تاشراوی گەورەگەورە دروست کراون کە هەندێکیان (٢٠٠) تەن قورسن. ئەوەی شایانی باسە نزیکترین کانەبەرد لەوشارەوە زیاد لە پێنج کیلۆمەتر دوورە. ئەو خەڵکە ئەوسا چۆن ئەو تاشە بەردانەیان گواستۆتەوە ؟

لەساڵی ١٩٦١ دا رۆژنامەی ((پراڤدا)) ئەم هەواڵەی بڵاو کردەوە : ((دوێنێ بارێکی نائاسایی گەیشتە مۆسکۆ. لە ئێستگەی شەمەندەفەری ((کوداشیۆڤکا)) ڤاگۆنێکی تایبەتی تاشەبەردێکی گەورەی هێنا بۆ پەیکەری کارل مارکس کە لە کۆڕی ((سڤیردلۆڤ)) دائەنرێ. گواستنەوە و داگرتنی ئەو تاشەبەردەی سەنگی نزیکی (٢٠٠) تەنە کارێکی قورس و گرانە بۆ تێکنیکای ئەم سەردەمە.))

بڕواننە ئەم بەشەی دوایی : ((کارێکی قورس و گرانە بۆ تێکنیکای ئەم سەردەمە.)) ! دیارە بۆ ئەو کاتەی ((تیاخواناکۆ)) ی تیا دروست کراوە کارێکی قورس و گران نەبوە!!

شاری ((تیاخواناکۆ)) تاکە نموونە نیە لەسەر رووی زەمین کە ئەم جۆرە خانوبەرانەی تێدایە. لە کەلاوەکانی شاری ((بەعلەبەک)) پاشماوەی دروست کراوی ماوەتەوە کە سەنگی هەندێک لەبەردەکانی ئەگاتە (١٢٠٠) تەن.. هەتا ئێستاش لە ئیسپانیا پەرستگای ((ئاو و هەوای رەش)) بە پێوەیە کە بەرزیەکەی ٧٥ مەترە.

سەربانەکەی بریتیە لەیەک ((تەلەبەرد)) ی تاشراو و لووس کراوی دووهەزار تەنی !. وەک شارەزاکان ئەڵێن، بەیارمەتی بەهێزترین ئامرازی تێکنیکی ئێستا ناتوانرێ نەک سەنگی وا هەر بەرز بکرێتەوە، بەڵکو ناتوانرێ راشبکێشرێ! سەنگی بەردی ئەم سەربانە دەجار لە توانای بەهێزترین ((کرێن))ی[15] ئەم سەردەمە زیاترە!

یەکێک لە حەوت شتە سەیرەکانی جیهان کە نوسەرە کۆنەکان باسیان کردوە منارەکەی ئەسکەندەریەیە کە بە فەرمانی ((پتۆلۆمێ ی فیلادیلفی)) (سەدەی سێهەمی پێ.ز.) دروست کرابوو. ئەم منارەیە بریتی بوو لە دروستکراوێکی مەڕمەڕی سپی (١٥٠ – ٢٠٠) مەتری بەرز لەسەر رووی زەریاوە کە تیایدا دروست کرابوو. ئاوێنەیەکی گەورەی لەسەر بوو کە بە پێ ی پێویست ئەجوولا و تیشکەکەی لە دووری دەیەها کیلۆمەترەوە ئەبینرا !

زۆر ئەفسانە دەربارەی ئەم منارەیە ئەگێڕنەوە :

عەرەبەکان، کە لەسەدەی حەوتهەم دا میسریان گرت ئەیان وت کە ئەتوانرا ئاوێنەکەی بە گۆشەیەکی وا لار بکرێتەوە تیشکی رۆژ کۆبکاتەوە و لە دوورەوە پاپۆڕی دوژمن لە زەریادا بسوتێنێ. بۆیە سەیرنیە ناوی دۆرگەی ((فاروس)) کە ئەو منارەیەی لێ دروست کرابوو، لە هەموو زمانە ئەوروپیەکان دا جێ خۆی کردۆتەوە. ئێستا ئەم وشەیە لەزۆربەی ئەو زمانانەدا بە ((منارەی ناو ئاو)) ئەوترێت.

ئەگەر زیرەکی و بلیمەتی ئەندازیارە میعماری یەکەی نەبوایە ناوی بە نادیاری ئەمایەوە و نەمان ئەزانی.

---

١٥ – کرێن : Kran : وشەیەکی ئەلمانیە : ئامرازی بەرز کردنەوە و گواستنەوەی قورسایی . وەرگێڕ

کە منارەکە تەواوبوو فیرعەون فەرمانی پێ دا لەسەر پارچە مەڕمەڕێک، لە شوێنێکی دیاری منارەکەدا ئەمە بنووسێ :

((لە پتۆلۆمێ ی پادشاوە بۆ

خوای رزگارکردنی زەریاوانەکان))

فەرمانی فیرعەون بەجێ هێنرا. ساڵ هات و ساڵ رۆیشت و ئەو نوسراوە درزی دا و کەوتە خوارەوە. ئاشکرا بوو کە ئەندازیارەکە ئەو نوسراوەی لەسەر پارچەگەچێکی بە تۆزی مەڕمەڕ داپۆشراو نووسیوە. دیارە گەچ بەرگە ناگرێ و پاش کەوتنە خوارەوەی ئەم وشە پڕ لە شانازی یانە دەرکەوتن کە لەسەر مەڕمەڕێکی راستەقینە ئەندازیارەکە نووسیبوونی و لەژێر گەچەکەدا شاردبوونیەوە :

((لە سەسترانووسی کوڕی دیکسیپلانی خەڵکی

شاری کیندەوە بۆ خوای رزگار کردنی زەریاوانەکان))

بە پێویستی ئەزانین باسی چۆنیەتی لەناو چوونی ئەم منارەیە بکەین : بەندەری ئەسکەندەریە گەورترین دوژمنی ((قوستەنتینەپۆل))[16] بوو، گەورەترین هێزیشی منارەکەی بوو. ئیمپراتۆری بیزەنتی هەر هەوڵێکی دا بۆ لەناو بردنی بە فیڕۆ چوو، و لە دواییدا بڕیاری دا بە فێڵ ئەمە بکات. لەوەپێش وتمان کە میسر و ئەسکەندەریە کەوتبوونە ژێردەست عەرەبەوە.ئیمپراتۆری بیزەنتی قونسوڵێکی تایبەتی تازەی ناردە لای فەرمان رەوای ئەسکەندەریە، پێش رۆیشتنی بۆ ئەوێ چەند فەرمانێکی نهێنی پێ سپارد کە لەخۆی بەلاوە کەس نەیئەزانی. هەرکە گەیشتەکۆشکی فەرمان رەوای

---

١٦ - قوستەنتینەپۆل : ئەستەموڵی ئێستا و پایتەختی ئەوسای بیزەنتیەکان . وەرگێڕ

ئەسکەندەریە بە دزیەوە کەوتە بڵاو کردنەوەی ئەو هەواڵە گوایا فیرعەونەکانی میسر بەنرخترین سامان و خشڵیان لەژێر بناغەکەی دا شاردۆتەوە، ئەم هەواڵە هەر زوو ئەگەیشتە دەم پیاوماقوڵانی کۆشک و ئەوانیش بۆ خۆبردنە پێشەوە بەپەلە ئەیان گەیاندە فەرمان ڕەوا !

فەرمان ڕەوا ماوەیەکی زۆر خۆی گرت و لە دواییدا تەماع گرتی و فەرمانی تێک دانی منارەکەی دا.

دەستیان کرد بە هەڵوەشاندنی. کە نیوەیان روخاند فەرمان ڕەوا هەستی کرد ئەمە فێڵە و فەرمانی وەستاندنی ئەم کارە و دروست کردنەوەی دا، بەڵام زانای وا نەمابوو حیساباتی دروست کردنەوەکەی بزانێ. بۆ نەگبەتی ئاوێنە گەورەکەشیان خستە خوارەوە و بووبە هەزارەها پارچەوە، بەم جۆرە هیچ نەما کە ڕێگا نیشانی پاپۆڕ بدات و دوژمن بترسێنێ. ئەم نیوە منارەیە هەتا سەدەی چواردەهەم هەر بە پێوە بوو ئەوساش بوومەلەرزەیەکی بەهێز کارە نارەواکەی ئەو فەرمان بەرەی تەواو کرد و لەبنا تێکی دا. بە پێ ی هەواڵی ناو نوسراوە کۆنەکان بەرزی ئەو منارەیە ئەوەندەی خانوویەکی شەست نهۆمی ئەبوو بۆیەش کەس نەیتوانی دروستی بکاتەوە چونکە ئەو زانیاریانە نەمابوون کە کاتی دروست کردنی هەبوون. تەنها لەم سەردەمەی ئێمەدا مرۆڤ گەیشتە ئەو ئاستە زانیاری یەی بتوانێ شتی وا بەرز دروست بکات بەو مەرجەی پایەی ئاسن بەکار بهێنێ بۆ ((هەیکەلەکەی)). بێ گومان بۆ دروست کردنی منارە مەزنەکەی ئەسکەندەریە ئاسن بەکار نەهاتبوو !

* * * *

ئەتوانین زۆر لەسەر باسی زانیاری پێشکەوتووی گەلانی کۆن بڕۆین. ئەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێ ین ئەو زانیاریانە پاشماوەی بەرهەمی بەرزی تیشکی مرۆڤایەتی پێش کارەساتی لافاوەکەن – ئەو لافاوەی میسریە کۆنەکان بە ((لەناوبەری مرۆڤایەتی)) ناوئەبەن.

باشە لە کوێ بۆ ((بێشکە)) ی ئەم شارستانیەتە بگەڕێ ین ؟ درێژی کات و کارەساتی یەک لەدوای یەک وایان کردوە کە نەتوانین وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە. ئایا ئەمە شتێکی سەیرە لەکاتێکدا ڕووداوی مێژوویی زۆر نزیکمان لەبیر ئەچێتەوە، و هەواڵەکانیمان لێ ون ئەبێ ؟ ئێستا دەربارەی زۆر وڵات و گەلان تەنها ناوەکانیان ئەزانین کە ئەوانیش بەڕێکەوت لە نوسراوێکی کۆن دا بەرچاومان ئەکەون !

ئەو شارستانیەتەی لەپێش لافاوەکەدا هەبوە ڕەنگە هەتاهەتایە لێمان ئاشکرا نەبێ.. بەڵام ئەبێ ئەوە بزانین کە ئەو زانیاریانەی، بەشێکی کەمیمان پێ گەیشتوە، بەڵگەن بۆ سەلماندنی ئەوەی مرۆڤی ئەوسا تەنها ئەو مرۆڤە دڕندە و بێ جل و بەرگە نیە کەبە ڕاوەوە خەریک بوە، و زۆر لەوە بلیمەتتر بوە کەلامان ئاشکرایە !

بۆ زانین و دەرخستنی ئەو شارستانیەتە ئەوەش دژمان ئەوەستێتەوە کە بێجگە لە دووری ئەو کاتە، زۆر وشکانی و نیشتمانی گەلانی کۆن ڕۆچوون و بوون بە ژێر ئاوی زەریا و ئۆقیانووسەوە. لەم جۆرە ڕووداوانە زۆرن. بۆ وێنە، ((ئیفلاتون)) دەربارەی وشکانی یەکی گەورە ئەدوێ کە گوایا لە ئۆقیانووسی ئەتڵەسی دا هەبوە. بەقسەی ئەو، ئەو زەویە گەورەیە ((لە ئەنجامی بوومەلەرزەدا لەناوچوە و بوە بە ژێر ئاوەوە و قوڕاوێکی وای

لەسەر رووی ئاوەکە پەیدا کردوە ئێتر کەس نەیتوانیوە لەو شوێنە نزیک بێتەوە.)) ئیفلاتون ئەم هەواڵەی لە سۆلۆنەوە وەرگرتوە و ئەویش لەکاتی چوونی دا بۆ میسر لە زانا ئاینی یەکانی ئەوێ ی بیستوە.

فەیلەسوفی یۆنانی ((کرانتۆر)) ی خەڵکی سۆلی ((ساڵی ٣١٠ پ.ز.)) کە چوە بۆ میسر لەوێ میلێکی گەورەی بینیوە مێژووی ئەو دۆرگەیەی لەسەر نوسراوە کە نوقومی ئۆقیانووسی ئەتڵەسی بوە. هەندێک شارەزایان هۆی ڕۆچوونی ئەو دورگەیە بەکارەساتێک ئەزانن و دوور نیە ئەو کارەساتە بێ کە لەم پەڕاوەدا باسمان کرد. نیشانەی ئەوەش زۆرە کە ناوبەناو چەند وشکانی یەک نوقومی ئەتڵەسی بوە. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە مێژوونووس و زانایانی جوغرافیا دەربارەی تەنها یەک دۆرگە نادوێن کە رۆچوە بەڵکو باسی دۆرگەی ((کرۆنۆس)) و ((پەسپێدە نۆس)) و هی تریش ئەکەن کە وردەوردە نوقومی زەریا بوون.

هەواڵی نوقوم بوونی وشکانی لەناو گەلانی ئۆقیانووسی ((هێمن)) یش دا هەیە. بۆ وێنە، گەلی دۆرگەکانی خوارووی رۆژئاوای نیوزیلاندا ئەڵێ ین کە لە کۆن دا زەریا دورگەی ((کاخۆوپا – ئۆ – کانێ)) – ((واتا لەشی کانێ ی خوا)) ی قووت داوە. لە پۆلۆنیزیادا زۆرجار دەربارەی ((زەوی یە مەزنەکە)) ئەدوێن. دانیشتوانی دۆرگەی ((پاسک)) باسی زەوی ((مۆتۆ – ماریۆ – هیڤا)) ئەکەن کە چوە بەناخی ئۆقیانووس دا.

زانایانی ئارکیۆلۆژی و دۆزینەوەکانیان ئەمانە ئەسەلمێنن بۆ وێنە، لە نزیک دۆرگەی ((پۆناپێ)) وە کە یەکێکەلە دۆرگەکانی ((کارولین))

پاشماوەی شارێکیان دۆزیەوە نیوەی پتر نوقومی زەریا بووبوو. وادیارە لە ئۆقیانووسی ((هێمن)) یش دا هەروەک لە ئۆقیانووسی ئەتڵەسی دا، پەیتاپەیتا وشکانی رۆچوە.

ئۆقیانووسی هیندیش لە ((قووت دانی)) وشکانی بێ بەش نیە. لەهەندێک نوسراوی کۆن دا باسی وشکانی یەک ئەکات کە ئەفەریقا و هیندستانی بەیەکەوە بەستوە و هاتوچۆی پێدا کراوە. ((پلینی)) دەربارەی زەوی یەکی فراوان نووسیویەتی کە کەوتۆتە خوارووی هێڵی ئیستیواوە لە ئۆقیانووسی هیندی دا. هەندێک مێژوونووسی عەرەبیش دەربارەی پاشماوەی چەند وشکانی یەکی ناو ئۆقیانووسی هیندی یان نوسیوە.

دۆزینەوەکانی ئەم چەند ساڵەی دواییەش گەواهن بۆ ئەمە. زانایانی زمان لەیەک نزیکی هەندێک لە زمانەکانی ((دراڤین)) ی خوارووی هیندستان و رۆژهەلاتی ئەفەریقا باس ئەکەن. روەک و گیانداری ئەم ناوچانەش ئەوە ئەگەیەنن کە کاتی خۆی نێوانیان وشکایی بوە. لە دۆرگەی ((مەدەغەشقەر)) دەها چەشنی نیوە مەیموونی ((لیموور)) هەن کە بێجگە لە ئەفەریقا تەنها لە هیندستان ئەبینرێن. وەک ئاشکرایە ((لیموور)) مەلە نازانێ و نەیتوانیوە ئاوی ئۆقیانووس ببڕێ. ٢٦ جۆر روەک بێجگە لە مەدەغەشقەر لە هەموو جیهان دا تەنها لە خوارووی ئاسایدا ئەڕوێن لەکاتێکدا کە لە ئەفەریقای نزیک مەدەغەشقەردا وێنەیان نیە. (٩) جۆری تری روەکی مەدەغەشقەر تەنها لە پۆلۆنێزیادا ئەڕوێن کە بە هەزارەها کیلۆمەتر لە ئۆقیانووسەوە دوورە. لەئەفسانەی گەلانی خوارووی هیندستان دا هێشتا بیرەوەری بوونی وشکانی یە ئەفسانەییەکەی ((لیمووری)) لەناو ئۆقیانووسی هیندی دا هەر ماوە. یەکێک لە مێژوونووسە کۆنە

هیندی یەکان ئەڵێ : ((نیشتمانی تاماڵەکان لەزۆر کۆن دا کەوتبوە خوارووی دۆرگەی ناڤالامی فاروانەوە کە یەکێکە لەو دۆرگانەی پاش کارەساتی لافاوەکە پەیدا بووبوون، زەوی لەناوچووی لیمووریش هەرلەوێدا بووە کەلەوەپێش لانەی شارستانیەتی مرۆڤایەتی بوو.))

ئێمە هیچ بەڵگەیەکی تەواومان بەدەستەوە نیە کە بڵێ ین لانەی ئەو شارستانیەتەی کارەساتی لافاوەکە لەناوی بردوە ئێرە، یان ئۆقیانووسی ئەتڵەسی یان ئۆقیانووسی هێمن و وشکانیە نوقوم بوەکەی و پەیکەر و نوسینە سەیرە بە جێ ماوەکانیەتی کە لە ئەفسانەکان سەیرتر و سەرسوڕهێنەرترن.

ناشزانین ئەو زانیاریانەی زانا کۆنەکان پێ یان گەیشتوە لەکوێوە وەریان گرتوە. لەوە ئەچێ وەک لە ((نامەیەکی داخراوی بێ ئەدرەسی نێرەرەکەیەوە بۆیان هاتبێ. رەنگە ئەمانەش ئەوەندە کۆن بن بۆیە ناتوانین نە ئەو نوسراوانە بخوێنینەوە، و نە تەلیسمی نهێنی ئەو پەیکەرانە بشکێنین.

* * * *

شتێکی تر، ئەگەر ئەو بیروڕایانەی لەم پەڕاوەدا هێنامانە گۆڕێ راست بن و مرۆڤایەتی رۆژێک لە رۆژان بتوانێ لە کەلاوەکان دا ئەو شارستانیەتە بدۆزێتەوە ئەوە چاکترین بەڵگە ئەبێ بۆ سەلماندنی یەکێتی و نەپچڕاندنی مێژوو، ئەو یەکێتی و نەپچڕاندنەی کاتی خۆی ((ک. مارکس)) دەربارەی نووسی.

بۆیە ئەگەر ئەمانەی وتمان راست بن ئەبنە بەڵگە بۆ ناڕاستی بیروڕا بورژوازی یەکان کە بڕوایان بە شارستانیەت و پێشکەوتنی ((لەپڕ پەیدابوو)) هەیە.

* * * *

## ((پەڕاو سووتاندن))

کارەسات و دووری لە شارستانیەتی کۆنەوە تاکە هۆ نین بۆ نەزانینی ئەو شارستانیەتە. بێجگەلەمە دوو هۆی تریش هەیە :

یەکەم : دەستەی ((پارێزەر)) ی زانیاری یە ئاینی یەکان زۆر گرنگیان ئەدا بە بڵاو نەبوونەوەی نهێنی ئەو زانیاریانە، چونکە بڵاو بوونەوەیان چاوی خەڵکیان ئەکردەوە و ئەمەش دژی ئارەزووی ئەوان بوو. زۆرجاریش بڵاوبوونەوە و پێشکەوتنی زانیاری مەترسی ئەگەیەنێ بە مرۆڤایەتی. نموونەی ئەم جۆرە زانیاریە سامناکانە لەم سەردەمەدا بۆمبای ئەتۆمی و چەکی وێرانکاری یە.

دووهەم : زۆرجار مرۆڤ خۆی ئەو زانیاریانەی لەناو بردوە و لەدەست خۆی داون. باشترین نموونە بۆ ئەمە لەناوبردنی دەستنووسەکانی ((مای)) ن. لەساڵی ١٥٤٩ دا قەشە ((دێیگۆدی لاندا)) گەیشتە مەکسیک کە تازە لەلایەن ئیسپانیەکانەوە داگیر کرابوو. لەبەر ئەوەی دڵی ئەو ((بت پەرستانە)) بەلای خوای راستەقینەدا وەرگێڕێ بڕیاری دا بنچینەی ئاینی بت پەرەستی بەدەستی خۆی لە ریشە هەڵکێشێ.لەیەکێک لە پەرسنگاکانی ((مای)) دا کتێبخانەیەکی زۆر گەورەی دەستنووسی کۆنیان دۆزیبوەوە، بەدرێژایی رۆژێک بەفەرمانی ئەو قەشەیە کتێبی کۆن و نیگاری سەیریان گواستەوە بۆ گۆڕی بەردەم پەرستگاکە. کە لەمە بوونەوە ((دێیگۆدی لاندا)) بەدەستی خۆی شاپڵیتەیەکی ئاگری پێوەنا. ئەو قەشەیە لەوەپاش نووسی ((ئەم کتێبانە بێجگە لەباسی بت پەرەستی و بێ بڕوایی کە شەیتان فێری کردبوون هیچی تریان تێدا نەبوو، بۆیە هەموویمان سووتاند.))

لەهەموو نوسراوەکانی ((مای)) تەنها سێ کتێب رزگاریان بوو !

پاشــە رۆژی نووســـراوەکانی ((ئینـک)) یـش بەهــەمان شـێوەی پڕلەناسۆر بڕایەوە. ئەمەیان بەم جۆرە بوو : لەناو گەلی ((ئینک)) دا درمێکی ترسناک پەیدا بوو. کە راوێژیان بە ((جادوگەر)) ەکەیان کرد چارێک بدۆزێتەوە وەلامـی دانـەوە : ((چـار ئەوەیـە نووسـین قەدەغـە بکرێ.)) ئەوسا بە فەرمانی سـەرۆکەکەیان هـەموو دەستنووسـەکانیان سـووتاند و نووسـینیان قەدەغـە کرد. تـەنها لـە پەرسـتگای ((رۆژ)) دا چەند نوسـراوێک مایەوە کـە مێژووی ((ئینک)) یـان دەرئەخسـت. ئەو گەنجینەیەی ئـەو نوسـراوانەی تێدا شـاردرابوەوە تـەنها سـەرۆکەکانی ئینک و هەندێک لە پارێزەرانی کەرەسـتەی ئاینی مافیـان هـەبوو بچنـە ناوی و بۆ هەموو خەلکی تر قەدەغە بوو.

پـاش رابـوردنی چەنـد سـالێکی دوور و درێـژ کـە نوسـراوەکان هەموویان لەناو بران و نوسین لەترسی فەرمانی مردن لەبیر چوەوە، یەکێک لـە پیاوە ئاینی یـە چاونەترسـەکان ئـەلف و بێ یـەکی نـوێ ی دانا. بەلام لەئەنجام دا بەو هۆیەوە بە زیندوویی سـوتێنرا.

لەســالی ١٥٧٢ دا چــوار نوســراو، کەلــە لایــەن ئیســپانیەکانەوە دزرابوون نێرران بۆ ((مەدرید بەدیاری بۆ فیلیپی دووهـەم، بـەلام بـۆ نەگبەتی ئەو پاپۆڕە نوقوم بوو، و ئەو بارە بەنرخەی لەناخی زەریـادا شاردەوە و نەگەیشتە ئیسپانیا. ئەو چوار دەستنووسە لـەناوچوە تاکـە بیرەوەری نووسینی ((ئینک)) ەکانە کە بە ئێمە گەیشتوە.))

شارەزایان ئەڵێن کتێبخانەکانی ((کارڤاگین))[1] زیاد لە (٥٠٠٠٠٠) دەستنووسیان تێدا بوە، ولەمانە تەنها یەک دەستنووس رزگار بوە و وەرگێرراوەتە سەر لاتینی، چونکە رۆماییەکان بۆ لەناو بردنی مێژوو، و شارستانیەتی ئەو گەلە هەموو شوێنەوارێکیان سووتاند.

موسوڵمانەکانیش بەهەمان شێوە، نەک هەر نوسراوە کۆنەکانیان لەناوئەبرد بەڵکو خەلاتیان دانابوو بۆ ئەو کەسانەی بە ئارەزووی خۆیان نوسراویان ئەهێنا بۆ لەناوبردن. بەم جۆرە هەموو نوسراوە کۆنەکانیان سوتاند.

ئاشکرا بوە کەکاری سووتاندن و لەناو بردنی دەستنووس ئەوەندەی نوسراوەکان خۆیان کۆنن.

هەموو دەستنووسەکانی فەیلەسوفی یۆنانی پرۆتاگۆڕ (سەدەی پێنجەهەمی پ.ز.) سوتێنرا. ئەمە یەکێکە لەو ئاگرە کۆنانەی چاکترین نوسراوی مرۆڤایەتی لەناو بردوە، لەسەدەی سێهەمی پ.ز. دا شاپلێتەی کتێب سووتاندن لە چین هەڵکرا و ئیمپراتۆر ((تسین)) نوسراوەکانی ((کۆنفوشیۆس)) ی سووتاند و ئەو کەسانەشی هەر سووتاند کە هاوکاری بیروڕاکانی ئەو فەیلەسووفە بوون.

((ئەنتۆیخ ئێپتیڤان)) ی شای سوریا دەستنووسی جولەکەکانی سووتاند. لە (٢٧٢)ی پ.ز. دا لە رۆما دەست بە سووتاندنی کتێب و لەوەپاشیش ((ئۆگۆست)) ی ئیمپراتۆر فەرمانی دا هەر نوسراوێک باسی ئەسترۆنۆم بکات بسووتێنرێ.

---

١ - کارڤاگین : شارێکی بەناوبانگی مێژووی کۆنە کە ئەکەوتە ژووررووی ئەفەریقاوە و رابردوویەکی شارستانیەتی زۆر ناوداری هەبوو ، و بەیەکێک لەسەرچاوەی بلیمەتی و زانیاری سەردەمی پێش عیسا ئەژمێردرا . وەرگێڕ

بەم هۆیەوە لەوهەموو سەرچاوە بەرین و بەنرخانە و ئەو ئەدەب و زانیاریانــە شـتێکی ئەوەنـدە کـەممان پـێ گەیشـتوە کـە بـە هـیچ نـاژمێردرێن، بۆیــە زۆر گرانــە بــەهۆی ئــەو زانیــاری یــە کەمانــەوە نەخشــەی شارسـتانیەتی بەرزی کۆن بکێشـین ، بۆ وێنە، ئەبێ چی دەربارەی نوسراوەکانی ((سۆفۆکلیس)) بزانین کەلە (١٠٠) کتێب تەنها (٧) ی بەئێمـە گەیشـتوە ؟ لـە (١٠٠) درامـای ئێڤروپید تـەنها (١٩) یـان ئەزانین، لەهەموو نوسراوەکانی ((ئەریستۆتیل)) تەنها یەکێکیان[٢] مـاوە و دەربــــارەی ئــــەوانی تــــری تــــەنها لەنوســــراوی نوســــەرەکانی هاوچەرخیەوە ئەزانین.

ئاشکرایە کە مێژوونووسی مەزنی کۆن تێت لیڤی (٥٨ پێ.ز — ١٧ ز) مێژووی رۆمای بە (١٤٢) بەرگ نووسیوە و لەمانە تەنها (٣٥) یـان ماون. لە (٤٠) کتێبی ((پۆلیبی)) پێنجیان لە مردن رزگـار بـوە. لـە (٣٠) کتێبی ((ئاتسیت)) چواریان و لە (٢٠) کتێبی ((پلینی)) هیچیان نەماوە.

کتێبخانە مەزنەکەی شاری ((پێرگاما)) ی ئاسیای بچووک زیـاد لـە (٢٠٠٠٠٠) دەسـتنووســی دانســقەی تێـدابوە، ((ئــەنتۆنیۆ)) هــەمووی بــەدیاری نــارد بـۆ ((کلیۆپـاترە)) و لــەوەپاش خۆڵەکەشـیان نــەمان. بەهــەمان شــێوە گەنجینــەی نوســراوەکانی پەرســتگای ((پــت)) ی ((مەمفیس)) ی میسری و پەرستگای ئۆرشەلیم لەناو چوون.

ئەی چی گەنجینەیـەکی نـرخ نـەزانراوی کتێبخانەکـەی ((خۆفـۆ)) و ((پتۆلۆمێ ی)) لەناوبرا ؟ تەنها کتێبخانەیـەکی پتۆلۆمێ ی (٤٠٠٠٠) و

---

٢ – لەدوا وتەی ف . پێرۆفسکی دا بۆ چاپی پۆیتیکای ١٩٥١ کەلە ١٨٩٣ دا ((ئەپیلرۆت)) وەری گێراوە بۆ روسی دەرئەکەوێ کە دوو کتێبی ئەریسـۆتیل مـاون : پۆیتیکا وریتۆریکا و نەک یەک کتێب وەک نووسەر ئەڵێ . وەرگێر

کتێبخانەیەکی تری (٥٠٠٠٠٠) دەستنووسی تێدا بوو و زۆربەیان سووتێنران. یەکەمیان لەکاتی سووتاندنی کەشتی گەلەکەی ئەسکەندەریەدا لەلایەن یۆلیۆس قەیسەرەوە ئاگری گەیشتێ و لەناوچوو، لە دووهەمیشیان دا هەر کتێبێک باسی ((جادوو)) ی تێدابوو سووتێنرا. لەوە پاشیش خەڵک دڕندانە هێرشیان ئەبردە سەر ئەو کتێبخانەیە و کتێبیان ئەسووتاند. موسوڵمانەکان کە میسریان گرت ئەم کارەیان بە تەواوی گەیاندە ئەنجام و کۆتایی یان بەو کتێبخانە مەزنەی ئەسکەندەریە هێنا.

ئیمپراتۆر و کاربەدەستانی تری وەک ((دیوکلێیان)) هەر بە ئارەزوو کتێبیان ئەسووتاند. ئەم کارانە هەرچەندە دڕندانە بن بەڵام ئەو کاربەدەستانە هەر لەسەری ڕۆیشتوون و کردوویانە، چونکە هەر چیەک بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتیان و مانەوەیان لەسەر تەخت بەکەڵک بووبێ دریغی یان لێ نەکردوە. ئەمانە هەمیشە سڵیان لە مرۆڤی زانا و زانینی بەرز کردۆتەوە و بەجێ ی مەترسی یان داناون. بۆیە ئەم ڕووداوەی خوارەوەش نابێ سەرمان سوڕ بهێنێ :

جارێک ئاگاداری ((ئیڤان گرۆزنی)) ی قەیسەری ڕوسیایان کرد کە بێگانەیەک ژمارەیەکی زۆری کتێبی هێناوەتە ڕوسیا. کە قەیسەر ئەمەی زانی فەرمانی دا چەند کتێبێکی لەوانە بۆ بهێنن. ئەو کتێبانە ئەوەندە بلیمەتانە نووسرابوون کە قەیسەر هیچیان لێ ی تێنەگەیشت. بۆ ئەوەی ئەو زانیاری یە بەرزانە بەناو گەل دا بڵاو نەبنەوە فەرمانی دا هەموو کتێبەکان لەو بێگانەیە بسەنرێ و چەند پارەی ئەوێ بیدرێتێ و لەپاشدا هەموویان بسووتێنرێن.

## ((زانیارییە شاراوەکان))
## ((ئاشکرا کردنی نهێنییەکان راستی دەرئەخەن))
## (دەستنووسەکانی زەریای مردوو)

بەم جۆرە، زانا کۆنەکان بەشێک لە بلیمەتی شارستانیەتە کۆنەکانیان دەربارەی ئەسترۆنۆمی و کۆسمۆلۆجی و جوغرافی و هتد.. بۆ پاراستووین. ئەو زانیاری یانەی کە هەتا ئێستاش نازانین چون وە لەکوێوە وا لەپڕ پەیدابوون.

بەشێکی تری ئەو زانیاری یانە بەهۆی سووتاندنیانەوە هەتاهەتایە ون بوون و ناگەڕێنەوە. دوابەشیشی پارێزەرە کۆنەکانیان شاردوویانەتەوە و ونیان کردوون چونکە مانەوەیان مرۆڤی زانا و پڕ مەترسیان دورست ئەکرد. ئەو ((پارێزەر)) ی زانیاری یانە هەر زۆر لەوە ئەترسان نوسراو، و زانیاری یەکانیان بکەونە دەست سەرکردە سوپایی و فەرمان رەواکان، چونکە ئەیانزانی بەمە دەسەلاتی خۆیان کەم ئەبێتەوە.

زانایەکی ئەلکیمی چین پێش هەزارەها ساڵ نووسی : ((ئەوپەڕی گوناهە زانیاری خۆت فێری سەرباز و سەرکردەکانیان بکەی. ئاگات لە خۆت بێ، نەهێڵی هەتا مێرولەش بگاتە ئەو شوێنەی ئیشی تێدا ئەکەی.)) کابالا [1] باسی کتێبێک ئەکات کە بۆ ئەوەی دەست ((ناحەزان)) نەکەوێ لە قوولایی ئەشکەوتێکدا شاردوبوویانەوە. هەتا ((نیوتن)) یش بڕوای بەوە هەبوە کە ((هەڵگر)) ی زانیاری هەیە و لەم

---

١ - کابالا : وشەیەکی جولەکانەیە : زانیاری ئاینی جولەکە کە بەشێوەی ((رەمز)) ی و نیشانەی نادیار دەرئەخرا . وەرگێڕ

بارەیەوە نووسی : ((نهێنی مەزنی وا هەیە کە زۆر لە گۆڕینی خاسیەتی میتاڵەکان گرنگترە، ئەگەر ئەوەی گێرمێس دەربارەی نووسیوە راست بێ وا هەمیشە جیهان بەهۆی ئەو نهێنیانە لەمەترسی دایە.

((پلوتارک)) ئەڵێ کە ئەسکەندەری مەکەدۆنی زانیاری لەچەند لایەکەوە وەرگرتوە کەلە هیچ سەرچاوەیەکدا نەنوسراوەتەوە. کەزانی ((ئەریستۆتیل)) ی مامۆستای کتێبێکی دەربارەی ئەمە نووسیوەتەوە رەخنەی لێ گرت و تاوانی ئاشکراکردنی زانیاری یە نهێنی یەکانی خستە ئەستۆ و پێ ی ووت : ((تۆ هەڵەت کردوە کتێبت دەربارەی ئەو زانیاری یانە نووسیوەتەوە کە نابێ بنووسرێن و هەر ئەبێ دەماودەم فێری ((خەڵکی هەڵبژاردە)) بکرێن، کەچی تۆ بەناو گەلدا بڵاوت کردوونەتەوە.))

پیاوانی ئاینی بۆ ئەوەی نەهێڵن زانیاری یە گرنگەکان بگەنە دەست خەڵک زۆر بە نهێنی ئەیان پاراستن. ((رێگڤید)) نووسی : ((هەرکەسێک وشەیەکی نهێنی زانین فێربوو با بە نهێنی بیهێڵێتەوە و کەسی تر فێر نەکات.)) نوسراوێکی سەر بەڕەدا میسری یەکان بەم وشانە دەست پێ ئەکات و کۆتایی دێت :

((دەمت داخە و هیچ بەکەس مەڵێ !))

لەکاتی ((رەمسیس)) ی سێهەم دا دوو فەرمانبەری کتێبخانەی کۆشکی فیرعەون بەوە تاوانبار کران کە بە تەواوی نهێنی نوسراوێکی بەڕەدایان نەپاراستوە. ئەوەی شایانی باسە تەنها پیاوە ئاینی یە ((هەڵبژاردەکان)) ئەیان توانی بگەنە زانیاری یە نهێنی یەکان.

لەوەپاش باسی تۆتخ (گێرمیس) مان کرد کە پێش لافاوەکە نوسراوی کۆ کردۆتەوە و لەفەوتان پاراستوونی و لەپاش لافاوەکە لەو زمانە پیرۆزە نهێنی یەوە وەری گێڕاونەتە سەر زمانی ئاسایی. کتێبەکانی گێرمیس (یان رەنگە بەشێک لەو کتێبانە) تیشکێکی روناکی یان خستەسەر زانیاری ئاینی و فەلسەفی لەوەپاشی مرۆڤایەتی. ((کلیمات)) ی خەڵکی ئەسکەندەریە لە (٤٢) کتێبی ((پیرۆز)) ی گێرمیس دواوە. ئەو نوسراوانەی گێرمیس کە دەربارەی فەلسەفە و ((جادوگەریی)) بوون هەر بە نهێنی هێڵرانەوە. لەوەپاش، ئاینە تازەکان بێجگە لە نوسراوە ئاشکراکانی خۆیان بە دزیەوە نوسراوە نهێنی یەکانیشیان بەکار ئەهێنا، بەڵام بێ سنوور بەنهێنی ئەمانەوە. هەندێک فەیلەسوف و زانایانی ئاینی لایان وایە کە ((عیسا)) زانیاری نهێنی فێری دۆستە هەڵبژاردەکانی خۆی کردوە بەو مەرجەی ئەوانیش بە نهێنی بیهێڵنەوە. لە ئاینی جولەکەدا هەندێک ((کابالا)) هەیە کە تەنها ئەبێ بەدەم بوترێتەوە و نەنوسرێتەوە نەک بگاتە دەست ئەوانەی ناشێ بیزانن. بۆیە زانایانی ئاینی ئەو شتانەی ئەیانزانی نەیان ئەنووسیەوە و لەگەڵ خۆیان ئەیانبردە گۆڕەوە.

بەم جۆرە، بەرزترین زانیاری ئەو سەردەمە نەئەنوسرایەوە و دەماودەم ئەگێررایەوە. ئەو نیشانە و رەمزانەی لەکاتی باس کردنی ئەو زانیاری یانەدا ئەوتران واتاکانیان ئەشێواند و هەریەک بە جۆرێک تێ یان ئەگەیشت. ئێستا نزیکی (١٠٠٠٠)) نوسراوی ((ئەلکیمی)) ماوە کە تێگەیشتنیان ئاسان نیە. ئایا ئەم سەد هەزار نوسراوانە نرخیان چەندە ؟ نازانین !

ئێستا زانایان گەردوونیان پشکنیوە، رابەر ئەنێرن بۆ دوورترین گۆشەی سەرزەوی، خەریکن بگەنە هۆی دروست بوونی ((مادده))، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا لەوەدا کۆلّن بگەنە زانیاری یە نهێنی یە کۆنە ون بوەکان، چونکە بۆ ئەمە پێویستە نیشانە و رەمزی بێ سنوور بخوێننەوە و تێ یان بگەن. زانای ناسراوی سەدەی شازدەهەم ((بلاس ڤێژنیۆر)) تەنها زانای ئەلکیمی نەبوو، بەلّکو شارەزایەکی زۆر نایابی دروست کردنی رەمز و ((شفره)) ش بوو. هەندێک لە زانیاری یەکانی لەبارەی شفرەوە هەتا ئێستاش بەکار ئەهێنرێن. ئەم شارەزاییەی لە نوسراوی زانا ئەلکیمیاییەکان وەرگرت و رەمز و نیشانەکانیان فێربوو. وەک خۆی نووسی : ((ئەو نوسراوانە بە نیشانە و رەمزی نزیک لە نیشانە و رەمزی کتێبە نهێنی یە کۆنەکان نووسرابوون.))

((ف. ئەنگلس)) لەکاتی خۆی دا نووسراوێکی ئینجیلی بەم جۆرە شی کردەوە : ((.. ئەو باسانەی لە ئینجیل دا بەرووداوی نوح و ئیبراهیم ناسراون مەبەست لەو خێلە کۆچەری یانەی ئەو سەردەمەن کە زاراوەی قسەکردنیان لەیەک نزیک بوە..)) دوایی ئەلّێ : ((ئەو خێلّ و ناوانەی لە ئینجیل دا نوسراون بە رادەیەکی کەم یان زۆر لەلایەن زانایانی کۆنەوە بەلّگەیان لەسەرە و سەلمێنراون.)) هەروەها زاناکان ئەلّێن کە ئەم ناوانە، هەرچەندە بە پێ ی زاراوەی ئێستا کەمێک گۆڕاون بەلاّم لە راستیدا هەندێکیان هێشتا هەر ماون[٢].

---

٢ - کارل مارکس و ف . ئەنگلس : دەربارەی ئاین ، مۆسکو ١٩٥٥ ل ( ٩٥ ) .

شی کردنەوەی هەندێک رەمزە لەمە گرانترە. لەوەپێش باسمان کرد کە سۆمەری یەکان ماوەی سووڕاندنەوەی کۆمەڵە ئەستێرەکانیان بە (٢٥٩٢٠) ساڵ داناوە. زۆرجار ئەم ژمارەیە بەشێوەیەکی شارراوە دەرئەکەوێ وەک مەتەڵ پێویستە هەڵبهێنرێ. بۆ وێنە : لە کتێبخانەی پەرستگاکانی ((نیپور)) و ((سیپارا)) دا خشتەی لەیەک دان و بەسەر یەک دابەش کردن لەسەر بنچینەی (١٢٩٦٠) دانراوە. پێویست ناکات زۆر بلیمەت بین بۆ ئەوەی بزانین کە ئەم ژمارەیە بریتی یە لە دابەشکردنی ((٢٥٩٢٠)) بەسەر ((٢)) دا، واتا ٢٥٩٢٠/٢ = ١٢٩٦٠ !

شی کردنەوەی لەمەش گرنگتر هەیە بۆ ئەم ژمارەیە.

لە سۆمەردا بێجگە لە ژماردنی : ((دە)) و ئەوەندە جار ((دە)) ژماردنی ((شەست)) ئەوەندە جار ((شەست)) باوبوە. بەڕای ئێمە بازنە و فەزا ((بۆشایی)) ئەکرێت بە (٣٦٠) پلەوە و سەعات بە (٦٠) دەقیقەوە و دەقیقە بە (٦٠) سانیەوە – ئەمانە هەمووی لە سۆمەری یەکانەوە، یان لە شارستانیەتێکی لەوان کۆنترەوە وەرگیراون، ئەمەش نیشانەیەکی ئاشکرای پەیوەندی نێوان ((کات)) و ((بۆشایی)) یە کە تازە مرۆڤایەتی خەریکە بیگاتێ – ئەو ئەنجامەی لەزۆر کۆنەوە مرۆڤایەتی پێ گەیشتوە !

رێچکەی ژمارەی ((شەست)) هی سۆمەری یەکان بەم جۆرە بوە : سۆس = (٦٠). ئەگەر ژمارە (٢٥٩٢٠) بەسەر (٦٠) دا دابەش بکەین ئەکاتە (٤٣٢). بانیشانەی ئەم ژمارەیەمان لەبیر بێ و بزانین لە کوێ ی تردا بەرەنگاری ئەبینەوە. لەپێش هەموو شتێک دا لە داستانی کۆنی هیندی ((ماخابخارات)) دا ئەیبینی.

لەو داستانەدا دەورەی گەردوون (٤٣٢٠٠٠) ساڵە.

((بیروس)) ی بابلیش هەمان نیشانەی نووسیوە. ((بەڕای ئەو ماوەی فەرمانڕەوایی پادشایانی پێش لافاوەکە (٤٣٢٠٠٠) ساڵە.)) ئەفسانەیەکی ئیسلاندی باسی شەڕی خوا و دوژمنەکانی لە ئاسمانی سەروودا ئەکات و دەربارەی (٥٤٠) دەرگا ئەدوێ کە لەهەریەکێکیانەوە (٨٠٠) شەڕکەر دێتە دەرێ، ئەم دوو ژمارەیە لەیەک بدەین چی دەرئەچێ ؟ هەمان ئەو ژمارە نهێنی یە :

٥٤٠×٨٠٠ = ٤٣٢٠٠٠ ! کەواتە، تەنها ئەو کەسە کلیلی ئەم نهێنی یانەی لابوە و زانیویەتی ((سۆس)) چیە واتای ئەم ژمارەیەی زانیوە. زۆر کتێبی ئاینی بەم شێوەیە زانیاری یان داپۆشیوە و نهێنی یەکانیان شاردوونەتەوە. بۆ وێنە، ((کابالا)) گەردوون بە کۆشکێک دائەنێ کە (٥٠) دەرگای هەیە و هەموویان بەیەک کلیل ئەکرێتەوە. بەهەر چوار لادا یەکی (١٠) دەرگای لەسەر ئەکرێتەوە، (٩) دەرگای تر بەرەو ژووروو ئەڕوات، ئەمێنێتەوە دەرگایەکی تر کە هیچ شتێک دەربارەی نازانرێ و هەتا نەکرێتەوە نازانرێ بۆ کوێ ئەچێ : بۆ سەرەوە یان بۆ ژێرەوە ((واتا بۆ ناخی بێ بن)). بەلام ئەوە ئاشکرایە کە هەرکەس لەو دەرگایەوە چوە دەرەوە ئیتر ناگەڕێتەوە. شاردنەوەی زانیاری یە ((پڕ مەترسی یەکان)) کارێکی کۆنە. یەکێک لەو باسە هەرە کۆنانە بەسراوە بەناوی ((ئاشۆکا))ی ئیمپراتۆری هیندەوە (٢٧٣-٢٣٩ پێ.ز) ئەم کوڕەزای ((چاندرا گووپتا)) یە کە هیندستانی یەک خست بڕوای وابوو بۆ ئەوەی ناوی نەمرێ ئەبێ شەڕ بکات، بۆیە هێرشی بردەسەر ((کالینگا)) ی دراوسێ ی. لەم

شـەڕەدا دانیشـتوانی ((کالینگـا)) پاڵەوانانـە بـەرگری یـان کـرد. لـە شـەڕێکدا سـوپای ئاشـۆکا (٧٠٠٠) سـەربازی دوژمنیـان کوشـت. کـە ئێوارە پاش تەواوبوونی شەڕ ((ئاشۆکا)) هاتە کۆڕی شـەڕەوە و ئـەو هەموو خوێنە رژاوەی دی حەپەسا. هەموو ژیانی پاش ئـەم شـەڕەی تـەرخان کـرد بـۆ زانسـت و پێشخسـتنی ئـاینی ((بـووزا)). ئـەڵێن ئـەو شـەڕە ئەوەنـدەکاری تـێ کـرد بڕیـاری دا هــەموو هێـز و توانـای بخاتـەکار بـۆ ئـەوەی جـارێکی تـر هێـز و زانینـی مرۆڤایـەتی نـەتوانێ شەڕی لەناوبردن بکات. بۆ ئەمەش دامەزراوێکی نهێنی هێنایە گۆڕێ کـە لـەوەپێش شـێوەی لەسـەر رووی زەوی نـەبوو، و بریتـی بـوو لـە ((کۆمەڵـەی نۆکەسـە نەناسـراوەکە)). ئیشـی ئـەم دامـەزراوە ئـەوە بـوو نـەهێڵێ تینـی دروسـت کردنـی کەرەسـتەی لـەناوبردن بگاتـە دەسـت خەڵک.

هەندێک ئەڵێن ئەم دامەزراوە هەتا ئێستاش هـەر مـاوە. ((ژاکۆلیۆ)) ی قونسـوڵی کۆمـاری دووهـەمی فەرەنسـا لەکەلکـەتا کـە نوسـەرێکی شارەزای ژیانی هیندە، لەسـەر ئـەم بیروڕایـە بـوە. هەنـدێک نـاودارانی ئینگلیزیش لە هیندستان هەمان رایان هەیە.

ئێمە هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نیە کە ئـەم رێکخراوە نهێنـی یـە لەپێش دووهەزار ساڵەوە هەتا ئێستا هەرمابێتەوە. بەڵام تەنها هەواڵی دورست بوونی ئەم دامەزراوە گرنگی یەکی زۆر ئەدات بەم باسە.

((ئاشـۆکا)) یەکـەم کـەس نـەبوە کەهـەوڵی داوە جڵـەوی زانیـاری وێـران کـاری بگرێتـەوە. ئەمـەش زۆر لـەوە ئـەچێ کـە ئـەمڕۆ پـێ ی ئەڵێن ((قەدەغە کردنی چەکی وێرانکاری)) !

لەساڵی ١٧٧٥ دا ((دیـوپیرۆن))ی زانـای مـەزنی فەڕەنسـی داوای بینینـی پادشـای کـرد بەمـەرجێک کەسـی لـێ نـەبێ چونکـە ئەیـەوێ هەواڵێکی وای پێ رابگەیەنێ کە پاشـەرۆژی وڵاتـی لەسـەر وەستاوە. لویسی شازدەهەم بەم بینینە قایل بوو. هاورێکانی ((دیـوپیرۆن))چەند سندوقێکی داخراویان هێنا بۆ شوێنی بە یـەک گەیشـتنەکە و رۆیشـتن. لەئەنجام دا دەرکەوت کە ((دیوپیرون)) چـەکێکی وای دروست کـردوە ئـەتوانێ سـەر بەهـەموو دوژمنێـک شـۆڕبکات. بـەڕای ئەوزانایـە ئیتـر پادشا ئەتوانێ بە ئارەزووی خۆی وڵاتەکـەی فراوان بکـات. ئەوچەکە بە باپیرەگەورەی چەکی ئۆتۆماتیکی ئێستا ئەژمێردرێ، چونکە بەپەلە پیتکەیەک (٢٤)گوللەی ئەهاویشت.

پادشا پێخۆشحاڵی خۆی دەرنـەبڕی و قسـەکەی پێ بـڕی و لـێ ی دوور کەوتـەوە. لـویس و وەزیرەکـانی ئـەم چەکـە لەناوبـەرەیان رەت کردەوە و ((دیۆپیرۆن)) یان بە دوژمنی مرۆڤایەتی لەقەڵەم دا. گومـان لـەوەدا نیـە کـە لـویس نەیهێشـتوە ئـەو زانایـە و چەکـە ترسـناکەکەی بگەنە دەست هیچ سەرکردەیەک. پاش ئەمـەش، کە چـەکی کوشـندەی سەرەکی تیروکەوان بوو، پاپا هـەوڵی دا هێزی کـەم بکاتـەوە، بۆ ئـەم مەبەسـتە بـەکار هێنـانی سـێ پـا و قـاچی قەدەغـە کـرد کـە تیروکەوانەکەی لەسەر دابنرێ بۆ ئەوەی باشتر نیشانی پێ بشکێ و لە فەرمانی ئەم قەدەغە کردنەدا پاپا وتی : ((ئەم جۆرە تیر هاوێشـتنە دڕندانەیـە.)) ((هەرلەبـەر هـەمان هـۆ ((شـامبۆ بـالۆنگۆ نگـۆ)) ی ئەفەریقیش شەڕە ڕمی قەدەغە کرد.

((رەچەتە)) ی دروست کردنی ((ئاگرە یۆنانی یە مەزنەکە)) [٣] کەبەوپەڕی نهێنی پارێزرابوو ون کرا و دەرنەکەوتەوە. دوور نیە ئەم قەدەغە کردنانەش بووبنە هۆی ئەو دیاردە سەیرانەی بەستراون بە مێژووی باروتەوە.

لەشاری ((فرێیبورگ)) ی ئەڵمانی پەیکەری ((بێرتۆڵدشڤارتس)) هەیە. ئەم قەشەیە لەسەر ((جادووگەریی)) خرابوە بەندیخانەوە، لەوێش هەر خەریکی تاقی کردنەوەکانی خۆی بوو. لەساڵی (١٣٣٠) دا هەندێک گۆگرد و خەڵوز و سیلیترای [٤] تێکەڵ کرد و کەرەستەیەکی تەقینەوەی لێ پەیدا بوو. ئەم ساڵە لە ئەوروپادا بەسەرەتای پەیدا بوونی بارووت دائەنرێ و لەوساوە بڵاوبۆتەوە.

بەڵام ئەگەر ئاوڕێک لە رابوردووی دوور بدەینەوە ئەبینین زۆر لەپێش ئەمەدا بارووت لەپڕ لەچەند جێگایەک پەیدا بوە و هەرلەپڕیش لەناو چوە و بۆ چەند سەدەیەک ناوی ون بوە.

ئاشکرایە کە پێنج سەدە پێش دۆزینەوەی بارووت بە ((رەسمی)) عەرەب لە گرتنی شارێکی ئیسپانیادا بەکاریان هێناوە. لەسەدەی حەوتهەم دا میسری یەکان بارووتیان زانیوە. لەمەش کۆنتر، لەسالانی هەشتای زاینی دا ((رەچەتە)) ی دروست کردنی بارووت لە هیندستانەوە گەیشتە چین.

---

٣ - ئاگری یۆنانی : چەکێکی ترسناک بوو لەشیوەی مەنجەنیق ئەهاوێژرا ، لەپێشدا دووکەڵێکی چڕی ئەکرد و ئەوسا ئەتەقیەوە و گڕی ئەگرت . ئەم چەکە لەسالی ( ٣٣٠ ) ی زاینی دا پەیدا بوو . وەرگێڕ

٤ - سیلیترا : وشەیەکی لاتینیە . کۆمەڵە خوێ ی کالیسیوم و سۆدیوم و ئامۆنیا و باریۆم و هتد .. کەلە دروست کردنی باروت و کەرەستەی تەقینەوەدا بەکار ئەهێنرێن . وەرگێڕ

سەیر ئەوەیە ئەم کەرەستە گرنگە جەنگیە بڵاو نەبۆتەوە. تاکە روون کردنەوە بۆ ئەمە ئەوەیە کە کۆمەڵە خەڵکێک هەبوون هەوڵیان داوە نهێنی ئەم چەکە کوشندەیە ئاشکرا نەبێ.

هەواڵی پاراستن و کۆکردنەوەی بارووت زۆر نهێنی بوە و نەهێڵراوە سەرکردە جەنگی و رامیاری یەکان شوێنەکەی بزانن، چونکە زانراوە کە ئەوانە هیچ سنوورێک نایان بەستێتەوە بۆ داگیرکردن و لەناو بردنی مرۆڤایەتی. ئەم نموونەیەی خوارەوە بەڵگەیە بۆ دۆزینەوە و لەناوبردنی زانیاری کوشندە. هونەرمەندی ناودار ((لیۆناردۆ داڤینشی)) نووسیویەتی : ((دەربارەی ئەو دۆزینەوەیە نانووسم کە ئەتوانم چەند بێ خواردن بمێنمەوە ئەوەندەش لەژێر ئاودا بمێنمەوە، نەک پیاو خراپان بەکاری بهێنن بۆکاری نابەجێ و خۆیان لەژێر پاپۆڕەکان دا مەلاس بدەن و کونیان بکەن و نوقومیان بکەن.))

بێ گومان ئێستا نازانین بەچی شێوەیەک زانای نابراو توانیویەتی ئەمە بکات. زۆر نهێنی تریش لەکۆن دا هەبوون. ئەمانەی لەمەولا باسیان ئەکەین نموونەن بۆ ئەمە.

## چەکی ((تووڕەیی خوا))

لە کتێبی ((ماخابخارات)) ی هیندی دا کە پێش (٣٠٠٠) ساڵ نوسراوە بەم جۆرەی خوارەوە باسی چەکێکی کوشندە ئەکات. ئێمە کەلەسەدەی بۆمبای ئەتۆم دا ئەژین ئەمەمان لا سەیر نیە، ئاخۆ ئەوسا چۆن سەیریان کردبێ ؟

((... بێ ئەوەی دووکەڵی لێ پەیدا ببێ لەشێوەی ئاگرێکی بەهێزدا دەرپەڕی و لەپڕ تەمێکی رەشی چڕ هەموو سوپای دوژمنی داپۆشی. هەرچوار لای ئاسۆ تاریک بوو، گرمەگرم دەستی پێ کرد و هەور بەناڵەوە بەخێرایی بەرەو ئاسمانی ژووروو بەرز بوەوە... رۆژیش وەک گێژ بووبێ و سەرە خولێ ی پێ کەوتبێ وابوو... جیهان بەهۆی گەرمایی ئەم چەکەوە ئەتوت لەرزی لێ هاتوە... ئەو فیلانەی گڕیان تێ بەربووبوو بەدەنگێکی ترسناک ئەیان نەڕاند و رایان ئەکرد.)) لەوە پاش کتێبەکە ئەڵێ : ((دیمەنی ئەم چەکە لە تیرێکی ئاسنی گەورەی رابەری مردن ئەچوو..)) لەوەپاش کە ((پاڵەوانەکە)) ئەنجامی ئەم شەڕەی بینی ویستی یەکێک لەو چەکانەی نەتەقیبوونەوە بەتاڵ بکاتەوە، بۆ ئەمە وردیان کرد و هاڕی یان، بەڵام ئەمەش دادی نەدان و ناچار خۆڵەکەیان کردە زەریاوە.

بێ گومان ئەمە تەقینەوەیەی دروست کراوێکی باروتی ئاسایی نیە. هەروەها ناشتوانین هۆی رووداوی پاش تەقینەوەکە روون بکەینەوە کە ئەڵێ : ((هێشتا شەڕ تەواو نەبووبوو شەڕکەرەکان

خۆیـان گەیانـدە روبارەکـە بـۆ ئـەوەی خۆیـان و جـل و چەکـەکانیان بشۆن..))

ئـەم چەکـەی لـە هیندسـتان نـاوی ((چـەکی براهمـا)) و ((گـڕی هیندستان)) بووە. لەخوارووی ئەمەریکا پێ یان ئەوت ((ماشماک)) و لە ئەفسانەی ((کیت)) دا بە ((هونەری بروسکە)) ناسرابوو. هەروەها وەک چۆن هێزی چەکی کوشندەی ئێستا بەژمارە ئەوترێت، ئەو چەکەش بەژمارە باس ئەکرا : ((سەد))، ((پێنج سەد))، ((هەزار)) و هتد.. ئەمەش ئەوەی ئەگەیاند کەهەر تەقینەوەیەکی چەکێکی وا ئەوەندە کەس ئەکوژێ. لە هەمان کتێب دا دەربارەی چەکێکی تریش ئەدوێ کە لەبەر ئالۆزی بەچوار کەس ئەتوانرا بتەقێنرێت. ((ماخابخارات)) بەم جۆرە باسی ئەو چەکە ئەکات : ((... کۆکرا بروسکەی ناردە سەر شارەکە، بەڵام کە ئەمەش کاری تەواوی خۆی نەکرد چەکێکی وای تەقاندەوە ئەوەندی هەموو گەردوون بەهێزبوو، و شارەکەی سوتاند.. روناکی تەقینەوەکە لە روناکی سەد هەزار رۆژ زیاتر بوو..)) ئەوانەی تەقینەوەی بۆمبای ئەتۆمیان دیوە بەهەمان شێوە بە تەقینەوەی رۆژی ئەشوبهێنن. کتێبی ((یوونگ)) ئەم چەکە هەروا ناو ئەبات : ((لە هەزار رۆژ روناکتر)).

لە هەندێک جێگای تردا ئەم چەکە بە ((بروسکە)) ناو ئەبرێ. لەو بڕوایەداین کە ئەم چەکە تەنها خەیاڵ نیە باس کرابێ. گۆڤاری (دۆزینەوە) ی ئینگلیزی نووسی کە زانایان لە دەمێکەوە خەریکی

دروست کردنی چەکی ((بروسکە)) ن کە ئەتوانێ یەکسەر نیشان بپێکێ و بە ئاسمانەوە چەکی دوژمن لەناوبەرێ.

دۆزینەوەی ئارکیۆلۆجی ئەم سالانەی دوایی بەڵگەن بۆ بوونی چەکی وا !

لەسەر دیواری قەلای ((دوندالک)) و ((ئێکۆس)) ی ئیرلەندی نیشانەی لێدانی گەرمایەکی وابەهێز هەیە کە بەردە گرانیتەکانی تواندۆتەوە. ئاشکرایە کە گرانیت لە پلەی هەزاردا ئەتوێتەوە. دوور نیە لێرە ئەو چەکە بەکار هێنرابێ کە باسمان کرد. نیشانەی ئەو چەکە لەم دواییەدا لە ئاسیای بچووکیش دا لەکاتی گەڕان بەدووی پاشماوەی شاری ((کاتووس)) ی پایتەختی ((خیت)) ەکاندا دۆزراوەتەوە.

کاتی خۆی ئەم شارە بە هۆی گەرمایەکی بەرزی نەزانراوەوە لەناوچوە. بەرای ((بیتێل)) هەرچەندە کەرەستەی تەقینەوە لەوشارەدا بەکار هێنرابێ ئەو گەرماییە بەرزەی دروست نەکردوە. ئەو گەرماییە ئەوەندە بەهێز بوە چینی دیوارە خشتەکانی تواندۆتەوە و کردوونی بەیەک پارچەی داڕێژراو، و بەردەکان ((برژاون)). لەهەموو شارەکەدا دیوارێک نیە ئەم حاڵە ترسناکەی بەسەر نەهاتبێ. وەک ((ک. گیرام)) ئەڵێ : ((ئەم شارە ئەبێ چەند رۆژێک، بگرە چەند هەفتەیەک لەسەر یەک سووتابێ ئەوسا وای لێ هاتبێ.))

لەناوچەی بابل منارەیەک هەیە کە پاشماوەکەی (٤٦) مەتر بەرزە و بە منارەی ((نەمرود)) ئەناسرێ – ئەو نەمرودەی ((یوسف فلاقێ

ی)) بە دروستکەری بورجی بابلی دائەنێ – زۆر لە زانایان ئەو پاشماوەیە بە بناغەی دروست کراوە مەزنەکەی بابلی ئینجیلی ئەزانن. ئەوەمان لەبیرە کە ئەفسانەکە ئەڵێ : ((.. خوا هاتە خوارێ و دروستکەرانی بورجەکەی لەناو برد و خەڵکەکەی تەفروتونا کرد.)) زانایان تەنها بەبوونی پەیوەندی لەگەڵ نوسراوەکانی ئینجیل دا وازیان نەهێنا و پاش تاقی کردنەوە و گەڕانێکی زۆر لێرەش شوێنەواری بەکارهێنانی گەرماییەکی بەرزیان دۆزیوە لەشێوەی شوێنەواری قەڵاکانی ((دۆندالک)) و ((کاتووس)). یەکێک لەزاناکان لەم بارەیەوە نووسی : ((تێ ناگەین چۆن ئەو گەرماییە دەستکردە توانیویەتی ئەو هەموو خشت و بناغە پتەو و دیوارە گڵانە بتوێنێتەوە !)) لەبەر ئەوەی زانایان بەڵگەی تەواویان بەدەستەوە نیە تەنها رووکەشی ئەو رووداوانە ئەنووسن کە دۆزراونەتەوە.

شوێنەواری بەکارهێنانی ئەم چەکە لە نوسراوێکی ((سترابۆن)) یش دا بەدی ئەکرێ. ئەو زانایە دەربارەی شاخێکی نزیک ((زەریای مردوو)) نووسیویەتی کە ((بەئاگرێکی نەزانراو بەردەکانی تواونەتەوە)) !

هەواڵی تری لەم چەشنە زۆرە کە زیاتر زانایان سەریان سوڕ ئەمێنێ. لەهیندستان پەیکەری ئێسقانی مرۆڤێک دۆزراوەتەوە کە رادەی ((تیشک هاوێشتن)) ی لەپەنجا ئەوەندەی رادەی تیشک هاویشتنی ئاسایی زیاترە. ئەمە ئەگەیەنێ کە ئەو مرۆڤەی پێش چوار هەزار ساڵ ژیاوە ئەبێ سەدەها جار پتر لە مرۆڤێکی ئاسایی بەر ((تیشک لێدان)) کەوتبێ و لە ئێسقانەکانی دا کۆ بووبێتەوە.

## ئایا مرۆڤ توانیویەتی ((بفڕێ)) ؟

نابێ زۆر خۆش بڕوا بین، هەروەها ناشبێ زۆر بێ بڕوا بین و یەکسەر ئەو نەریت و رەوشت و هەوالانە رەت بکەینەوە کەلەگەڵ زانینمان دا ناگونجێ و لە منداڵیەوە فێریان نەبووین و لە کۆمەڵ دا نەمان دیون. پێویستە مرۆڤ ئازایانە چی بە بیردا دێت ئاشکرای بکات و هەوڵی سەلماندنی بدات، چونکە بێ ئەمە دۆزینەوەی تازە نابێ.

دەربارەی ئەو زانیاری یە لەپڕ پەیدا بوانەی ناو گەلان دواین کە ناشێ خۆیان لە ئەنجامی تاقی کردنەوەی رۆژانەیان دا پێ یان گەیشتبن. بەڵگە هەیە کە سنووری ئەم زانیاری یانە لەوە فراوانتر بوون کە ئێمە ئەیزانین.

ئەفسانەی زۆربەی گەلان باسی ئەوە ئەکات کە چۆن خوا و هەندێک لە پاڵەوانان توانیویانە بەهۆی هەندێک ((عەرەبانەی باڵدارەوە)) بە ئاسمان دا بفڕن. بێ گومان نابێ ئەوەمان بیر بچێت کە فڕین بە ئاسمان دا ئاواتی زۆربەی گەلان و بیرتیژانی کۆن بوە. لەم بارەیەوە ئەفسانەی هیندی و ((مەکسیک)) ی یە کۆنەکان و نوسراوەکانی ئینجیل سەرنج راکێشن، و بە وردی نەک هەر باسی رووکەشی دەرەوەی ((ئامرازی فڕین)) ئەکەن بەڵکو شێوە و جۆری دروست بوونەکەشی روون ئەکەنەوە.

لە داستانێکی کۆنی هیندی دا کەناوی ((رۆمایان)) ە ئەمە ئەخوێنینەوە : ((کە رۆژ بوەوە (راما) چوە ئەو عەرەبانە ئاسمانی یەوە کە (پوشپاکا) لە (ڤیڤپیشاندا) وە بۆی ناردبوو، و خۆی ئامادە کرد بۆ فڕین. ئەم عەرەبانەیە لە خۆیەوە بەرز ئەبوەوە و زۆر گەورە

بوو، و بەڕەنگی جوان بۆیە کرابوو.. لە دوو نهۆم و چەند ژوورێکی پەنجەرەدار پێک هاتبوو.. کە ئەم عەرەبانەیە بە ئاسمان دا ئەرۆیشت دەنگێکی نەگۆڕاوی چوون یەکی لێ ئەهات..)) بەلام وەک باسی ئەکات لەکاتی ((هەستان)) دا ئەم عەرەبانەیە دەنگەکەی جیاواز بوو : ((.. کە (ڕامسا) فەرمانی دا، ئەم عەرەبانە رازایەوە بەناڵە و گرمەگرمێکی گەورە بەرز بوەوە..)) لەلایەکی تر ئەم داستانەدا ئەمە ئەخوێنینەوە : ((کە عەرەبانەکە بەرز ئەبوەوە بەهەر چوارلادا گرمەگرمی بلاو ئەکردەوە.)) لە نوسراوێکی کۆنی سانسکریتی دا ئەخوێنینەوە کە کاتێ ((عەرەبانەکە)) هەڵئەستا وەک شێر ئەینەڕاند...)) لە ئینجیلیش دا باسی ئەو ئامرازە ئەکات کە بە ئاسمان دا ئەفڕی و لەکاتی نیشتنەوەی دا ((ناڵەیەکی گوێ کەڕکەری لێ بەرز ئەبوەوە.))

لە ئەفسانە هیندی یەکان دا ئەڵێ کە ئەم ((عەرەبانە ئاسمانی یە)) لەکاتی فڕین دا روونـاکی ئەدا و وەک ((ئاگر لە شەوی تاریک دا)) ئەدرەوشایەوە. کتێبی ((ڕۆمایان)) ئەڵێ : ((وەک مەشخەڵی ئاگر روناکی لێ بەرز ئەبوەوە.)) ماخابخاراتیش بەم جۆەر باسی ئەکات : ((.. بروسکەیەکی باڵدار ئەیخستەگەڕ)). وەک ئەزانین ئینجیلیش دەربارەی ئامرازی فڕین ئەڵێ کە ((لەکاتی فڕین دا ئاگری فڕێ ئەدا.)) لەمەش سەرسوڕهێنەرتر باسی دروست کردنی ئەم ئامرازەیە کەلە ئەفسانە هیندی و کیلتی یەکان دا هاتوە.

کتێبی ((سامارانگانا سوترا دخارا)) ی سانسکریتی بە (٢٣٠) دێڕ باسی چۆنیەتی بەکار هێنانی ئامرازی ((فڕین)) ئەکات، بەلام پێش هەموو شتێک ئەمە ئەنووسێ : ((باسی دروست کردنی ئەم ئامرازە ناکەین نەک لەبەر ئەوەی نایزانین بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەمانەوێ بە

نهێنی بمێنێتەوە.. چونکە ئەگەر نهێنی دروست کردنی هەموو پارچەکانی بڵاو ببێتەوە لەوانەیە بۆکاری خراپ بەکار بهێنرێ.))

لەوەپاش بەم جۆرە باسی شێوەی تێکڕایی ئەو ئامرازە ئەکات : ((ئەبێ لەشەکەی پتەو، و بەهێز بێ و لەکەرەستەی تەنک و سووک دروست بکرێ و شێوەی باڵندەیەکی گەورە بنوێنێ، لەناوەوە ئەبێ چوار ئامرازی ئاسنین هەبێ کەچوار مەنجەڵی پڕ لە جیوەیان لەسەر گەرم بکرێ، بەهۆی ئەو هێزەوە کەلەئەنجامی کوڵانی جیوەکەدا پەیدا ئەبێ ئامرازەکە هێزێکی وەک بروسکە پەیدا ئەکات و بەرز ئەبێتەوە و ئەبێتە گەوهەرێک لە ئاسمان دا)) !

نوسراوە ((تیبت)) ی یەکانیش باسی فڕینی ((گەوهەری ئاسمان)) ئەکەن. کتێبێکی تری سانسکریتی بەناوی ((گخاتۆتراچابادما)) وە بەم جۆرە باسی ئامرازێکی ((فڕین)) ئەکات : ((.. ئەمە عەرەبانەیەکی زۆر گەورەی ئاسمانی بوو کەلە ئاسنی رەش دروست کرابوو.. کەرەستەی زلەزلەی تێدابوو کە بەهۆیانەوە ئەجوولا و بەرز ئەبووەوە و هیچ پێویستی بە فیل و وڵاخ نەبوو رایکێشێت.)) کتێبی ((سامارگانگا سوترادخارا)) ئەڵێ گوایا بۆ دروست کردنی ئەم ئامرازە قورقوشم و مس بەکار هێنراوە.

نوسراوە کیلتیەکانیش دەربارەی ئامرازێک ئەدوێن کە ((بەهۆی جۆرە ئەسپێکی جادوگەری یەوە بەرز ئەبووەوە کە لە ئەسپ نەئەچوون و بە ئاسن داپۆشرابوون و خواردنیان نەئەخوارد و گۆشت و ئێسقانیان نەبوو..))

لە نوسراوێکی ((کیلت)) ی کۆن دا باسی شەڕێکی ئاسمانی نێوان ((کۆچۆلانی)) پاڵەوان و دوژمنەکەی ئەکات. لەکاتی شەڕەکەدا کۆچۆلانی توانی دوو ((شت)) ی سپی گەورەی ئامرازی فڕینی

دوژمنەکـــەی بشـــکێنێ و یەکســـەر عەرەبانـــە ئاســـمانی یەکـــەی بەگرمەیەکی گەورەوە بخاتە خوارەوە و لەناوی ببات.

یۆنانی یە کۆنـەکان باسـی گـەلی ((گیپـەربۆر)) ی نەناسـراو ئەکـەن کەلەبەشی ژووررووی سـەرزەمین دا ژیـاون و سـاڵی جارێک رۆژیـان لێ هەڵهاتوە. ئەوانیش توانیویانە بفڕن.

بـەم بۆنەیـەوە ئـەوە ئەخەینـەوە یـاد کـە ئـاری یـە کۆنـەکان باسـی ئامرازی فڕینیان هێنایە هیندستان.. و ئەوانیش توانیویانە بفڕن..)) [1]

چەنـد سـاڵێک لەمەوبـەر لەسـەر شـاخەکانی ئانـد ((ریگـای ئینـک)) ەکان دۆزرایەوە، ئەو وێنانـەی لـە فڕۆکەوە گیران دەریـان خسـت کـە ئەمە رێگا نیە، بەڵکو کۆمەڵە هێڵ و نیشـانەیەکی بەرامبـەر یـەکن کـە تەنها لـە بەرزاییـەکی زانـراوەوە ئـەبینرێن. ئـەو نیشـانانەی بـریتین لـە ((هێڵی سێ گۆشە)) و هێڵی ((مەوازی))، بەشێوەیەکی ئیجگـار رێـک و پێـک بۆمـاوەی (١٠ – ١٥) کیلۆمـەتر درێـژ بوونەتـەوە. هەنـدێک لـەو نیشانانە ناوبەناو بـە شـێوەیەکی زۆر رێـک و پێـک دووبـارە ئەبنـەوە.. زاناکـــان ئـــەڵێن ئەمانـــە هێڵـــی ئەســـترۆنۆمین کـــە جووڵاندنـــەوەی ئەسـتێرەکانیان نیشـان داوە. بـەڵام ئێمـە ئـەوێرین بڵـێ یـن کـە ئـەو نیشـانانەی تـەنها لەبـەرزی یـەوە ئـەبینرێن دوور نیـە پەیوەنـدی یـان هـەبێ بـە ((ئـامرازی فڕینـەوە)) ! لـە ئەمـەریکاش شـتی وا هەیـە کـە دووبـارە هانمـان ئـەدات بـۆ ئـەوە ئـەم بیـرە بکەینـەوە. کتێبـی ((پۆپـۆل ڤـوخ)) ی هینـدی یـە سـوورەکانی ((کـیچ)) باسـی چـوار پیرەمێـردی رابردووی ئەم گەلە ئەکات کە لە ئاسمان دا ((شـتێک)) یـان دیـوە مـاڵ

---

١ – گومـان لـەوەدا نیـە کـە ((چـەرخ و فەلـەک)) ی پیریێژنی چیرۆکە کۆنـە کوردیـەکانیش ئامرازێکی فڕین بوە کە نووسەر وا بەدڵنیاییەوە باسیان ئەکات . ئەمـە ئـەوە ئەگەیـەنی کـە کوردیش بەشداری ئەو شارستانیەتە بەرزەی کردوە کەلەم پەڕاوەدا باس کراوە . وەرگێڕ

ئاوایی یان لە ژن و منداڵ و کەس و کاریان کردوە و بەپەلە خۆیان گەیاندۆتە سەر شاخەکان. ئەفسانەکە ئەڵێ گوایا پاش ئەمە ئەو چوارە لەسەر شاخی ((کاخاڤیتس)) ون بوون و کەس نە خۆیانی بینیەوە و نە لاشەکانیان.

ئەفسانەکانی ئەمەریکای ناوەراست دەربارەی ئافرەتێکی بەهێز ئەدوێن کە خەڵکی فێری ((زانین)) ئەکرد. پاش ماوەیەک داوای کرد بیبەنە سەر شاخەکە و ((لەناو هەروە بروسکە و ئاگردا ون بوو)). لەهەندێک ((شوێنی تاریک)) ی ئینجیلیش دا دەربارەی چەن ئامرازێک نوسراوە کە لەسەر لوتکەی شاخەکان نیشتوونەتەوە : ((لەبەرە بەیانی رۆژی سێهەم دا بروسکە و هەورێکی رەش لوتکەی شاخی سینای داپۆشی و ناڵەیەکی گەورە هات.. شاخی سینا چونکە خوا لەشێوەی ئاگردا لەسەری دابەزی هەمووی بوو بە دووکەڵ.. ناڵە و گرمەگرم هەتا ئەهات زیاتر ئەبوو.. تەنها پاش ئەوەی ((خوا)) گەیشتە سەر شاخەکە و دووکەڵ و هەورەکە تەرینەوە موساو هاورێکانی چوونە سەر شاخەکە..)) دوور نیە پیاوانی ئاینی خۆشیان هەوڵی دروست کردنی ئامرازی فڕینیان دابێ، بەڵگەشمان ئەمەی خوارەوەیە:

لە نوسراوێکی سەر بەرەدای میسر دا کە ئەگەرێتەوە بۆ (١٥) سەدە پێ.ز. و هەواڵی ((رەسمی)) پادشایەتی ((تۆتمۆس)) ی سێهەم باس ئەکات ئەڵێ. ((هەموو لەوە تۆقین کە لە سەعات شەشی مانگی چواری زستانی ساڵی بیست و دووهەمی پادشایەتی ((تۆتمۆس)) دا شتێکی زلی رێک و پێکیان دی لەسەرخۆ بە ئاسمان دا بەرەو باشوور ئەفڕی.))

هەر لەم کاتەش دا نوسراوە ئێرانی یەکان باسی ئەو پیاوە ئەکەن کە بە هۆی ئامرازێکەوە بە ئاسمان دا فڕیوە.

ئەمەی خوارەوەش نموونەیەکی ترە :

دەستنووسـێکی لاتینـی کڵێسـەیەکی ئینگلیـزی سـاڵی (١٢٩٠) نووسیویە : ((لـەکاتی لەوەڕانـدنی ئـاژەڵی کەنیسـە دا شـوانە ئـاینی یەکان شـتێکی سـەیریان دی بـە ئاسـمان دا لەشـێوەی دەوری یـەکی زیوین دا ئەفڕی.))

تۆ بڵێ ی ((ڕۆجەربیکۆن)٩ ی زانا و فەیلەسوف (١٢١٤ – ١٢٩٤) کە بەتاوانی پشتگیری کردنی ((زانیاری نهێنـی)) خرابوە بەندیخانەوە، مەبەسـتی هـەمان ئـامراز نـەبێ کـە نووسـیویە : ((بـەهۆی زانسـتەوە ئەتوانین ئامرازی وا دروست بکەین توانای خێراییەکی خـەیاڵی هـەبێ و تـەنها یـەک کـەس بتـوانێ لـێ ی خـوڕێ..)) ئەشـڵێ کـە ئـەو جـۆەر ئامرازانە بێ یارمەتی حەیوان ئەکەونە جووڵە.. ((ئەشـتوانرێ ئـامرازی وا دروست بکرێ مرۆڤێک بەرەو ئاسمان بەرزی بکاتەوە.))

لە دەستنووسێکی هیندی کۆن دا دەربـارەی ((فـڕین بەبەرزیـەوە)) نوسراوە : ((.. پاڵەوانەکە لەناو عەرەبانە ئاسمانی یەکەدا لە وڵاتی (با) نزیک بوەوە.

ئایا پاش ئەمـە ئـەوێرین بڵـێ ین کـە ڕەنگـە شارسـتانیەتێکی کـۆنی پـێش ئێمـە هـەوڵیان دابـێ بگەنـە ئەسـتێرەکانی تـر ؟ بـێ گومـان بـڕوا کردن بەمە زۆر گرانە. بەڵام با لەم نموونەیەی خوارەوە ورد ببینەوە. لـە دەستنووسـێکی سانسکریتی دا ئەمـە ئەخوێنینـەوە : ((بـەهۆی ئـەم ئامرازەوە مرۆڤی سـەرزەوی ئـەتوانێ بچـێ بـۆ ئاسـمان و دانیشـتوانی ئاسـمان بێنـە سـەر زەوی..)) ! لەجێگایـەکی تـری هـەمان سـەرچاوەدا ئەڵێ : ((ئەم ئامرازە ئەتوانێ لە سنووری خۆر، و لەمەش دوورتـر، لـە سنووری ئەستێرەکانی تریش دا بفڕێ.)) ! بـەپێ ی ئەفسـانە ((کیلـت)) ی یەکانیش عەرەبانـە ئاسـمانی یەکـە ئـەیتوانی ئەوەنـدە بـەرز ببێتـەوە بگاتە ئەو بەرزاییەی ((کۆشکی خواکانی لێ یە !))

زۆر هەواڵ دەربارەی ئەو گەشتانە ماونەتەوە کە گوایا خەڵک چوون بۆ ((کۆشکی خواکان)) کەلە سنووری ئاتمەسفێری زەوی دا نیە. ((تاوبس)) هکان باسی ((چێن جان)) ی بلیمەت ئەکەن کە گەشتۆتە ئەستێرەی تر و شتیان لێوە فێر بوە. لە کتێبی ((نهێنی یەکانی ئینۆخ)) دا – کە ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای پەیدا بوونی ئاینی عیسایی – ئەڵێ : ((بۆ ماوەیەک ئینۆخ یان برد بۆ ولاتێکی ئاسمان و لەوێ فێری بنچینەی زانیاری ئەستێرە ناسیان کرد و جوولاندنی خۆر و هۆی کورت بوونەوەی رۆژ و درێژبوونەوەی شەو، و سووڕاندنەوەی مانگیان تێ گەیاند.)) ئینۆخ لەوەپاش ئەنووسێ : ((.. فریتێل (٣٠) شەو و (٣٠) رۆژ بێ وەستان قسەی بۆکردم و شتی فێر کردم و منیش نووسیمەوە..)) بۆیە ئەم زانیاریانەیان فێری ((ئینۆخ)) کرد کە ئەویش خەڵکی سەرزەوی فێر بکات. نوسراوێکی کۆنی فەرەنسیش کە بەناوی :

(degabalis– Discourses ١٦٧٠)[٢] هوە دەربارەی دەرکەوتنی هەندێک ((پاپۆڕی ئاسمانی)) نووسیویە : ((جارێک لەشاری لیۆن سێ پیاو و ژنێک لە پاپۆڕێکی ئاسمانی دابەزین. هەموو دانیشتوانی شار لێ یان کۆبوونەوە و بەوە تاوانباریان کرد کە جادوگەرن و لەلایەن ((گریمالد)) ی فەرمان رەوای ((بێنفانتۆ)) وە نێرراون بۆ لەناوبردنی کشتوکاڵی فەرەنسە. ئەو چوارە هەوڵیان دا تێ یان بگەینن کە خەڵکی فەرەنسەن و لە لایەن چەند کەسێکەوە رفێنراون بۆ ئاسمان و شتی سەیر و ئەنتیکەیان پیشان داون بۆ ئەوەی بۆ ئەمانی بگێڕنەوە و پاش ئەمە دایان بەزاندوون – بەلام خەڵکەکە بڕوایان پێ نەکردن و

---

٢ – نووسەر ناوی ئەم نوسراوەی بە فەرەنسی نوسیوە و وەری نەگێراوەتە سەر روسی . بۆیە منیش هەروەک خۆی هێشتمەوە . وەرگێڕ

ئاگریان بۆ کردنەوە بیان سووتێنن. لەدوا هەناسەدا قەشەی شار فریایان کەوت و رزگاری کردن پاش ئەوەی لەو قسانەی کردبوویان پاشگەز بوونەوە.))

لەسەردەمی تازەتردا نیگارکێشی ناوداری روسی ((ن. رێریخ)) لە کتێبی دڵی ((ئاسیا)) دا کە دەربارەی ((گەشتی هیمالایا)) نووسیویەتی ئاوا لەم جۆرە ئامرازانە ئەدوێ : ((یەکێک لە لاما [٣] کان دەستی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و ووتی:

- ((ئەوە چیە ؟ ئەڵێ ی تۆپی سپی فووتێکراوە !))
- ((فڕۆکەیە؟))

لەبەرزاییەکی زۆرەوە شتێکی بریسکەدارمان دی لە باکوورەوە بەرەو باشوور زۆر بەخێرایی ئەکشا. سێ دووربینی بەهێزیان بۆ هێناین. کە ورد بووینەوە لەشێکی ((سفیرۆید)) [٤] ی زەبەلاحمان بینی لە ژێر تیشکی رۆژدا ئەدرەوشایەوە و بەباشی ئەبینرا. لەوەپاش رێگاکە گۆڕی بەرەو خوارووی رۆژئاوا و لەودیو لوتکە سپی یەکانی هیمالایا ون بوو !))

((هیرۆدۆت)) دەربارەی ئەو بەلەمە سەیرە دواوە کە بە خێراییەکی نەبینراوەوە لە ((جەبەل تاریق)) ەوە خۆی کردوە بە زەریای سپی ناوەراست دا. ئەوانەی ((هیرۆدۆت)) یان دیوە ئەڵێن گوایا بە دڵنیاییەوە وتوویەتی کە ئەو بەلەمە نە سەوڵی پێوە بوە و نە پەردەی بەسەرەوە بوە !

* * * *

---

٣ – لاما : وشەیەکی ((تیبت))ی یە . پیاوانی ئاینی ((بووزا)) .

٤ – سفیرۆید : وشەیەکی یۆنانی یە : Spharia تۆپ + edios شێوە : لەشتێکی ئیلیپسی کەبەدەوری تیرە گەورەکەی دا سووڕابێتەوە و لەشێکی درێژ کۆلەی هێلکەیی دروست کردبێ . وەرگێڕ

## ((با لە بڕیاردان دا پەلە نەکەین))

دەیەها سەدە ئەم چیرۆکەی هیرۆدۆت بە خەیاڵێکی دروست کراو ئەزانرا. خەڵک بە پێ ی زانیاری ئەو سەردەمە بڕوایان نەئەکرد کە بێجگە لە هێزی با و ماسولکەی مرۆڤ شتێکی تر هەبێ بتوانێ بەلەم و پاپۆڕ بجووڵێنێ. بلیمەتترین مێشکی ئەو سەردەمە نەیئەوێرا بڵێ کە وزەیەک هەیە بتوانێ ئەم کارە بەجێ بهێنێ.

کاتی خۆی باوەڕ بەکەوتنە خوارەوەی بەرد لە ئاسمانەوە – واتا میتیۆر – نەئەکرا.

ئەکادیمی فەرەنسی بڕیاری دەرکرد کە هەموو هەواڵێکی لەم چەشنە درۆیە و دروست کراوە. لاڤوازێ – هەتا لاڤوازێ ی مەزنیش – ئەم جۆرە هەواڵانەی بە ((دژی زانیاری)) ناوئەبرد.

ئەمە بەرێکەوت نیە. لە هەموو سەردەمێکی مرۆڤایەتی دا هەندێک نەریت و زانین هەن بەراست ئەزانرێن و هەوڵ ئەدرێ هەر بەراستی بمێنێتەوە. کاتی خۆی ئەم بیروڕایە لە ئاین دا زۆر بەهێز بوو، و هەرچی لەسنووری دەسەڵاتی ئاینی دا بوایە ((راست بوو))، و ئەوەی لەو سنوورە دەرئەچوو بە ((درۆ)) دائەنرا.

ساڵ هات و ساڵ رۆیشت و بیروڕای زانیاری تەنگیان بە بیروڕای ئاینی هەڵچنی. ئێستا ئەوە بەراست ئەزانرێ کە لەگەڵ سنووری زانیاری ئەم سەردەمەدا ئەگونجێ و هەر شتێک لەو سنوورە دەربچێ بەهەمان شێوەی کۆن بە ((درۆ)) ئەزانرێ. هەرلەبەر ئەمەشە لاڤوازێ بوونی میتیۆری رەت کردەوە و بڕوای پێ نەئەکرد.

با سەیرێکی بیروڕای ئێستا و کۆنی جیهان بەکەین. زۆربەی ئەو شتانەی ئەوسا باوەڕیان پێ نەئەکرا و بەدرۆ ئەزانران ئێستا ئاسایین و جێ ی بڕوان.

کاتی خۆی ((نیوتن)) بە شێوەیەکی ماتیماتیکی سەلماندی کە لەهیچ کاتێک دا ناتوانرێ ئامرازێکی وا دروست بکرێ لەهەوا قورستر بێ و بەرز بێتەوە و ((بفرێ))، کەچی ئێستا فڕۆکە بەهەر چوارلای جیهان دا ((فڕکەی)) دێ !

زانایانی زۆر ولات سەلماندبوویان کە ناتوانرێ فڕۆکەیەکی وا دروست بکرێ یەکسەر لەجێگای خۆیەوە بەرز ببێتەوە بەلام پەیدا بوونی فڕۆکەی ((هالیکۆپتەر)) ئەمەی بەدرۆ خستەوە.

زانای بەناوبانگ ((هـ هێرتس)) وتی کە دروست کردنی رادیۆ شتێکی خەیالی یە، چونکە بۆ ئەمە پێویستیمان بە ئەنتێن (ئایرێل) ی وا هەیە ئەوەندەی کیشوەرێک پان بێ. کەچی ئێستا بەهۆی رادیۆی بێ ئەنتێنەوە لەوپەڕی جیهانەوە بەرنامە وەرئەگرین.

ئێستا هێزی ترسناکی بۆمبای ئەتۆم لای هەموان ئاشکرایە. ئەوسا زانایان و شارەزایانی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بلاویان کردەوە کە ئەمە شتێکی نەشیاوە.

ئێستا ئێستگەی کارەبایی ئەتۆمی لەکاردایە، لەکاتێکدا کە زۆربەی زانایانی وەک ((ن. بۆر)) ی ناودار بڕوایان بەمە نەئەکرد.

ئێستا تەرکیبی کیمیایی ئەستێرەکان ئەزانرێ. کاتی خۆی فەیلەسوفی ناودار ((و. کۆنتوو)) زۆر بە دلنیاییەوە ئەیوت کە هەرگیز مرۆڤایەتی دۆزینەوەی ئەم کارەی پێ ناکرێ.

ئێستا سەلمێنراوە کە ٩٩% ی مادەی هەموو گەردوون لە دۆخی ((پلازما)) [١] دایە، کەچی هەتا ماوەی (٣٠) سالیش پاش دۆزینەوەی ئەم تیۆری یە زانایان رەتیان ئەکردەوە.

کاتی خۆی ئەکادیمی پزیشکی فەرەنسی دۆزینەوەکانی ((لویس پاستۆر)) ی رەت کردەوە.

---

١ - پلازما : وشەیەکی یۆنانی یە plasma : لێرەدا مەبەست لە دۆخی پڕ لە ((ئایۆن)) ە کە بەهۆی گەرماییەکی بەرزی ((ناوەوە)) پەیدا ئەبێ . وەرگێر

دۆزینەوەی تیشکی ((ئێکس)) بەگاڵتە پێکردنەوە باس ئەکرا.

کە ((مێسمێر)) باسی نواندنی موگناتیسی کرد مەزن ترین زانای ئەو سەردەمە پێ ی پێ ئەکەنی.

ئەکادیمی فەرەنسی ماوەیەکی زۆر دژی باس کردنی دۆزینەوەی شوێنەواری ((مرۆڤی کۆن)) وەستا و ((کەل و پەلی بەردین)) ی بە ((رێکەوتی یاری سروشت)) دائەنا.

ئەتوانین زۆر لەسەر ئەمە بڕۆین و لیستەی ئەو داهێنراو و دۆزینەوانە بێ کۆتایی درێژ بکەینەوە کەلە کاتی خۆی دا بەناوی ((زانیاری)) یەوە قەدەغە ئەکران، هەروەک چۆن لە رابوردوودا بەناوی ئاینەوە قەدەغە ئەکران.

ئەمەش بێ گومان نیشانەی لاوازی ((چالاکی)) بیرکردنەوەیە، یان وەک ((أ شوبینهاوەر)) ووتی : ((هەموو کەسێک سنووری زانینی خۆی بە کۆتایی جیهان ئەزانێ)) !

ئێستا مرۆڤایەتی پاش زانینی هەڵەی خۆی پەیکەر بۆ ئەو زانا پێشرەوانە دروست ئەکات کە لەکاتی خۆی دا دژیان ئەوەستا. ئێستا ئەمانەوێ ئەوانە زیندوو بکەینەوە کە سزایان ئەدرا و ئەسووتێنران و لەناوئەبران. ((ج. برونۆ)) کە یەکێکە لەو سزادراوانە لەم روەوە لەپەڕاوی ((بێ سنووری گەردوون)) دا نووسی : ((ئەگەر گاسنم بەدەستەوە بوایە و جووتم بکردایە، یان ئاژەڵم بلەوەڕاندایە، یان باخەوانیم بکردایە، یان جل و بەرگم پینە بکردایە کەس گوێ نەئەدامێ و بەسەر و گوێلاکیان دا نەئەماڵیم و رەخنەیان لێ نەئەگرتم و بەکاری هەموان ئەهاتم. بەڵام ئێستا من سروشت ئەپێوم، مێشک شی ئەکەمەوە و بڕیاری هەڵە راست ئەکەمەوە، کەچی هەرکەس ئەمبینێ لێم مۆڕ ئەبێتەوە و ئەوەی سەیرم ئەکات هەڕەشەم لێ ئەکات، و ئەوەی راوم ئەنێ گازم لێ ئەگرێ و ئەوەی بمگرێ ئەمخوا، ئەمەش وەنەبێ یەکێک یا چەند کەسێک وابن دەربارەم، هەموو هەروان..))

باشه، بۆچی ؟ بۆچی ((ناپلیۆن)) ی بلیمەت و مێشک فراوان و ئازا ئەیوت ناشێ پاپۆڕ دروست بکرێ بە هەڵم بڕوات ؟ ئەمەندە لەمە دڵنیابوو کە کاتێ ((ر. فولتۆن)) هەواڵی ئاسانی دروست کردنی پاپۆڕی وای بۆهێنا دەری کرد و گوێ ی لێ نەگرت و قسەکانی بە خەیاڵ زانی.

ئاشکرایە بە پێ ی ئاستی زانیاری ئێستا زۆر ئاسانە هەڵەی رابردوو دەربخرێت. لەبەر ئەوە بێ دەنگی باشترە !

* * * *

خوێندەواری بەرێز، دیارە لەوانەیە بڕوا بەهەموو ئەو شتانە نەکەیت کە لەم پەڕاوەدا نوسراون، ئەمە شتێکی ئاسایی و سروشتی یە. نووسەر خۆشی هەوڵی نەداوە هەمووی بە تەواوی بسەلمێنێ و لەسەدا سەد بەراستیان بزانێ، چونکە ئەگەر وابوایە نەمان ئەتوانی ناوی بنێ ین پەڕاوی ((هیپۆتیز)). بۆیە نووسەر زۆر حەز بە بوونی بیرورای جیاجیا ئەکات لەم بارەیەوە. من کە ئێستا دوا دێڕی ئەم کتێبە ئەنووسمەوە هیوام بەهێزە، کە توانیبێتم وات لێ بکەم بیر لەم شتانە بکەیتەوە. دیارە هەتا زۆرتر بیری لێ بکەیتەوە زیاتر ئەتوانی لەو سنووورە دەربچیت کە ئێستا باوە و ئاسایی یە.. باوەڕم بەهێزە کە پاشە رۆژ زانیاری نوێ و راستیی تازەمان دەربارەی رابوردوو ئەداتێ، ئەوساش زۆر شت روون ئەبێتەوە کە پەیوەندی یان بە باسەکانی ئەم پەڕاوەوە هەیە. لەبەر ئەوە پێویستە بەباشی ئامادە بین بۆ وەرگرتنیان، چونکە، وەک ئاشکرایە، پاپۆڕی گەورەی ((ئۆقیانووس بڕ)) تەنها لە بەندەرە گەورەکان دا لەنگەر ئەگرێت و بەلای بەندەری بچووک دا تێ ئەپەڕێ و ناوەستێ. دەبا خۆمان ئامادە بکەین بۆ رووداو و هەواڵی چاوەڕێ نەکراو و نوێ، کە بێ گومان دێن.

## زنجیرە چاپکراوەکانی
## ناوەندی توێژینەوەی مێژوویی جەمیل رۆژبەیانی

سەرهەڵدان و ئاوابوونی زەردەشتیگەریی: ئار. سی. زێر/ وەرگێرانی: شەماڵ تەرغیبی.

فەلسەفەو ئایینی زەردەشت: ئەحمەد عەباسیان/ وەرگێرانی: رەزا مەنوچەری.

زەردەشت و دینی بهدینان: دکتۆر عەلی ئەکبەر جەعفەری/ وەرگێرانی: هیوا میرزایی.

پاسەوانانی کەمالیزم : دکتۆر خەلیل عەلی موراد/ وەرگێرانی: بەرزانی مەلا تەها- د. سەلام عەبدولکەریم.

پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) لە پێوەندییە هەرێمییەکانی تورکیادا (١٩٨٠-١٩٩٩): د. سەلام عەبدولکەریم.

عادات و رسووماتنامەی اکرادیە (داب و نەریتی کورد): مەلا محمموودی بایەزیدی/ وەرگیرانی: پ .د. شوکریە رەسوڵ ئیبراهیم.

توێژینەوەیەکی لۆجیکی فەلسەفەیی: لۆدڤیگ فتگنشتاین/ وەرگێرانی: د. حەمید عەزیز.

کوردستان لەسەدەکانی ناوەراستدا: کەیوان ئازاد ئەنوەر.

بنەماکانی ئیتیک و ئیتیک لەراگەیاندنی کوردیدا: د. مەغدید سەپان.

گوندنشینی لە هەرێمی چیایی: پ.د.خەلیل ئیسماعیل محەمەد د. ئەیوب خەلیل ئیسماعیل.

مێژووی بیری ئابوری: لەبیب شوقەیر/ وەرگێڕانی: فەیسەل عەلی.

زانایانی ئایینی کورد و قوتابییە ئەندەنوسیەکانیان: مارتن ڤان بروینەسن/ وەرگێڕانی: مینە.

جوولەکەکانی شاری سلێمانی: لێکۆڵینەوەی: ڕێبوار حەمەتوفیق.

تێڕوانینی شۆڕشگێڕانە بۆ پرسی ئایین: عەبدوڵا ئۆجەلان/ وەرگێڕانی: ستارە عارف